# باشترین شیعرەکانی نیچە

## هۆنراوەکانی زەردەشت

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

**ڕێباز مستەفا**












- **باشترین شیعرەکانی نیچە** هۆنراوەکانی زەردەشت
- وەرگێڕانی  لە فارسییەوە: ڕێباز مستەفا
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: مراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ١٦٢٦
- نرخ:  ١٢٥٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٢٥٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٥٥)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێشەکی

ناوو ناوبانگی "نیچە" بەرادەیەکە کە رەنگبێ پێویست نەکات بەخوێنەرانمانی بناسێنین، چونکە هەموو ئەوانەی کەم تا زۆر ئاشنایەتییێکیان لەگەڵ ئەدەبو فەلسەفەی بیانیدا هەیە ناوی ئەویان بیستووەو بەرهەمو نووسینی ئەویان خوێندۆتەوە.

(فریدریش نیچە- Friedrich Nietzsche) بەدڵنیاییەوە یەکێك لەسەیرترین کەسایەتیەکانی مێژووی جیهانە. رەنگە یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی ئەو کەسێتییە سەیرە ئەوەبێ کە هیچ نووسەرو شاعیرێك بەئەندازەی ئەو دوژمنی نەبووبێ. ئەو پیاوە کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ژیا، دروست لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا مرد (١٨٤٤ ــ ١٩٠٠)، رەوا یا نارەوا بەفاکتەرو وەرێخەری سەرەکیی یەکێك لەگەورەترین بزاڤە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانی ئەم سەدەیە (واتە سەدەی بیستەم) ناوزەد کرا، کە بەرهەمەکەی خوێناویترینو هۆڤناکترین مرۆڤکوژیی مێژووی مرۆڤایەتیی بوو، بەڵام لەراستیدا نیچە گوناهێکی لەدروستبوونی بزاڤی تۆقێنەرو توندوتیژیی (نازیزم) بەتایبەت لەهێستریای هۆڤیگەرانەی سەرانی ئەو بزاڤەدا نەبوو.. راستە ئەو ژمارەیە (واتە سەرانی ئەو بزاڤە) خۆیان بەپەیرەوکارانی فەلسەفەی نیچە ناودێر کرد، بەڵام زۆر ئاسانە لەوە تێبگەین کە جۆری هزری راستەقینە نێوان نیچە و ئەوەی ناسیۆنال سۆسیالیستەکانی ئاڵمانیا ئەنجامیاندا، جیاوازییان ئاسمان و رێسمانە.

نیچە لایەنگری بنەمای دەسەڵات بوو، بەڵام ئەو دەسەڵاتە لەروانگەی ئەودا لایەنێکی تایبەتیو مۆراڵی هەبوو کە زۆر قووڵترو مەزنتر بوو لەتێگەیشتنی "نازی" لەدەسەڵات.



بێگومان ئەمە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە فەلسەفەی نیچە بەڕاستی مایەی قبووڵ بێ، چونکە شێوەی بیرکردنەوەو فەلسەفەی "نیچەییزم" لەبنەڕەتدا لەگەڵ ژیانی ئێمەدا یەك ناگرێتەوە. نیچە خۆیشی سەرەنجام لەشڵەژانی بەردەوامی دەروونیو گۆشەگیریو شێتی بترازێ، نەیتوانی بەو فەلسەفەیە بگاتە ئەنجامێك. رەنگە هەر لەبەرئەوەش بێ کە ئەو لەهیچ یەك لەنووسینو شیعرەکانیدا ناڵێ "بەدوای مندا وەرن" بەڵکو هەر ئەوەندە دەڵێ: "ئەمە رێگایەکە کە من هەڵمبژاردووە". جگە لەوە خۆشی ناگاتە دوا قۆناغی رێگاکە، چونکە لەڕاستیدا ئەو رێگایە رێگای مرۆڤ نییە، رێگای " ئەو دیوی مرۆڤ"ە کە فەلسەفەی نیچە بەدەوریدا دەخولێتەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوشێوە هەستکردنو شێوە بیرکردنەوەیە، پڕە لەشکۆو مەزنایەتیی پیاوانە، کە هەموو بەرهەمەکانی نیچەی گرتۆتەوە. ئەو شکۆیە، شکۆیەکی تایبەتە کەهیچ چەشنە لاوازیو رەشبینیەکی تیانییە، تەنانەت ئەو پێکەنینە گاڵتەئامێزەی کە لەزۆربەی بەرهەمەکانی ئەودا بەدی دەکرێ، پێکەنینێکی شەیتانی نییە، هی پیاوێکی بەهێزە کە بەرانبەر خەڵكو خۆی پێدەکەنێ.

"زەردەشت وەهای گوت" ئەو بەرهەمەیە کە کەسایەتیو هزرو فەلسەفەی نیچەی بەشێوەیەکی تەواو تیادا بەرجەستەیە.

لەسەرتاسەری ئەو کتێبەدا، جۆشو خرۆشو گەشبینیو"بەرزە فڕیی" تایبەتی نیچە لەگەڵ رۆح و شێوەی دەربڕینی شاعیرانە کە پتر تایبەتە بەنیچە، بەدی دەکرێ. لەو کتێبەدا ئیتر شوێنەواری ئەو هەستە نەرمو نیانە بەدی ناکرێ، کە لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی نیچەدا هەیە، چونکە ئیتر ئەو هەستە جێی خۆی داوەتە جۆشوخرۆشێکی زۆر قووڵترو گاڵتەئامێزترو تاڵتر. پارچەیەکی بەرز لەو کتێبەدا هەیە کە رەنگە بشێ بەترۆپکی هونەر و هزری نیچەی دابنێین و ناوی "ئاوازی شەو ــ Das nachtilied"ە. ئەو پارچەیە ئەگەرچی شیعر نییە و تەنها بەشێوەی پەخشانێکی کێشدار نووسراوە، لەڕاستیدا دەبێ بەیەکێ لەبەرهەمە شیعرییەکانی





نیچەی دابنێین. ئێمەش هەر لەبەرئەوە وەرگێڕانەکەیمان لەم کتێبەی بەردەستدا بڵاو کردۆتەوە.

ڕەنگە وەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵە بێجێ نەبێ، کە شیعری نیچە بەشی سەرەکی بەرهەمی ئەدەبیی ئەو پێکناهێنێ، چونکە گرنگترین بەرهەمەکانی نیچە کەبریتین لە"زەردەشت وەهای گوت"، "مرۆیی، زێدە مرۆیی"، "زانستی خەندان"، "لەودیوی چاکەو خراپە"، "ئەمەیە پیاو"و هیتر.. هەموویان بەپەخشان نووسراون. لەلایەکی ترەوە، ژمارەی شیعرەکانی نیچە یەکجار کەمن، بەجۆرێك کە هەر هەموویان ڕەنگە لەدوو هێندەی ئەم کتێبەی بەردەست تێنەپەڕن. بەڵام بەمەشەوە، ئەو هۆنراوە بەژمارە کەمانە بەئەندازەیەك بەهێزو پوختەو لەجۆری خۆیاندا بێهاوتان، تەنانەت لەچەندین ڕووەوە بێوێنەن، کە نیچەیان گەیاندۆتە ڕیزی گەورەترین شاعیرانی ئەڵمانی.

نیچە خۆیشی هیچ کات شیعرەکانی خۆی بەبەشێکی سەربەخۆو جیا لەبەرهەمە ئەدەبیەکانی خۆی نەدەژمارد، بۆیە تا کۆتایی قۆناغی ژیانیشی، ئەو شیعرانە وەکو کۆمەڵەیەکی جیاو سەربەخۆ بڵاونەکرانەوە. تەنها لەساڵی ١٨٩٤ بۆ یەکەمین جار "شیعرەکان"ی نیچە لەژێر ناوی "بەرگی هەشتەم" لەدووتوێی سەرجەم بەرهەمەکانی ئەودا لەلایەن "فریتس توگل" بڵاوکرانەوە.

ساڵی ١٨٩٨ خاتوو "فورستەر نیچە"ی خوشکی نیچەش کۆمەڵەیەکی سەربەخۆی لە شیعرەکانی براکەی بڵاوکردۆتەوە، کە بۆ یەکەمین جار چەند شیعرێکی قۆناغی لاوێتیی نیچەی تیا چاپکرابوون.

ئەو کۆمەڵەیە، بەرهەمە شیعرییەکانی قۆناغی هەڤدە ساڵیی شاعیرێتیی نیچەی لەخۆ گرتبوو، ساڵی ١٨٧١ (پارچەی An die melancholie) تاساڵی ١٨٨٧ (پارچەی Dionysos) کە بەشێکی گرنگی ئەو بەرهەمە بریتییە لە پارچەو کۆپلەی کورتو هەندێکیان پارچە شیعری زۆر کورتی شاعیران نزیکەی هەموو ئەو پارچە شیعریە درێژو کورتانە لەکتێبە جیاجیاکانی نیچە وەرگیراون، چونکە وەك باسمان کرد، نیچە خۆی هیچکات هەوڵی نەدا کۆمەڵەیەکی شیعریی سەربەخۆ بنووسێ.



جیاوازییێکی زۆر لە ڕووی بەهای ئەدەبیو توانای دەربڕین لەو بەرهەمە شیعریەدا هەیە. شیعرە سەرەتاییەکانی نیچە، زیاتر لە سروشتو هەستو نەستی لاوێتیەوە نزیکن، هەندێ جاریش ناسکیی هەستێکی تایبەتیان تیا بەدی دەکرێ، کە لەگەڵ سروشتو ڕوحی "نیچەیی"دا کۆك نییە، بەڵام لەنیوەی دووەمی ئەو کۆمەڵەیەدا، نۆرەی پارچەی بەرزو زۆر بەهێزو پوختە دێت، کە لەئەدەبیاتی ئەڵمانیدا بەبێهاوتا لەقەڵەم دراون. ئەو بەشە نزیکەی سەرجەم ئەو پارچانە دەگرێتەوە کە پەیوەندیان بە "زەردەشت"ەوە هەیە، واتە پارچەکانی: (لەسەرەوەی بەرزاییەکان ــ Aushohen Bergan)، (خامۆشیی ئاسنین ــ Das Eherne Schweigen)، خۆر ئاوا دەبێ ــDie Sonne Sinkt)، (هەژاریی ئەو کەسەی کە بەتواناترە ــ Von des Armutn Des Reichsten)، (شکۆی ئاریانا ــ Arianas Klage)، (شێتێك ــ شاعیرێك ــ Nur Warr Nur Dichter)، (لەنێو کچانی بیابان دا ــ Unter Tochternder Waste)، لەنێو باڵندە شکاریەکاندا ــ Zwischen Raubvogeln)، نیشانەی ئاگرین ــ Das Feuerzeichen)، شانازیو ئەبەدییەت ــRuhm Und Ewgkeit)و (دوایین خواست ــ Letzter Wille) کە لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هاتوون. هیچ دەستکارییێك لەم کۆمەڵەدا نەکراوە، تەنها خۆمان لەوەرگێڕانی هەندێ لەپارچە کورتەکانی دیکەی نیچە کە بایەخیان بەم پارچە ناوبراوانە ناگات بواردوە، بێجگە لەپارچەی (لەسەرەوەی بەرزاییەکان) پارچەکانی تر لەساڵی ١٨٨٨ بەدواوە نووسراون.

**وەرگێڕی فارسی**





## لەسەرەوەی بەرزاییەکان

ئەی نیوەڕۆی ژیان، ئەی ڕۆژگاری پڕشکۆ، ئەی باخی هاوینە، ئەی شادمانیی نیگەران، هەستە سەرپێ و گوێ بگرە: من ڕۆژ و شەو چاوەڕێی یارانی خۆمم. هۆ دۆستەکانم بۆ دواکەوتن؟ ئیتر وەرن، چونکە کاتی هاتن هاتووە!

مەگەر نازانن لەبەرخاتری ئێوە، ئیرۆ بەستەڵەکە خۆڵەمێشڕەنگەکانی کوێستان، بەرگی ئەرخەوانیان کردۆتەبەر؟ مەگەر نازانن ئەمڕۆ جۆگەلەکان لەگشت شوێنێکدا سۆراغی ئێوە دەگرنو لە سەرەوەی کوێستانەکان باکانو هەورەکان چاویان بڕیوەتە شوێنە دوورەکان تا بەڵکو نیشانەیەك لەهاتنی ئێوە بەدی کەن؟

لەسەر هەندێ چیاکان، خوانی پێشوازی بۆ ئێوە ڕاخراوە.

بەڕاست ئەوە کێیە هێندە لەئەستێران نزیك بۆتەوە؟ کێیە کە ئاوا بەکەنار خەرەندە قووڵو تاریکەکاندا هاتووە؟ کام قەڵەمڕەوی پادشایی هەیە لەقەڵەمڕەوی من فراوانتر بێ؟...

کێیە تامی شیلەی هەنگوینی منی چەشتبێ؟

وای! ئەی یاران، سەرەنجام هاتن! لێ ئەفسووس! دەزانم بۆ دیتنی من نەهاتوون. دەبینم کە نیگەرانو دوودڵ وەستاونو زۆر لەخۆتان دەکەن تا توڕە نەبن. ئەرێ بەڕاست، ئیتر من ئەو کەسەی کە بووم نیم؟ ئیتر نیشانەیەکم لەو سیماو ڕەفتارەی جاران نییە؟ یارانی من، ئەرێ بەڕاست ئەوەی کە هەم، شتێکی دیکەیە کە بەدوایدا هاتبوون؟ ئایا ئێستاکە کەسێکی دیکە؟ ئەو کەسەم کە هەمیشە پشتی خۆم لەزەوی بدەمو لەگەڵ هێزی خۆمدا لەشەڕدا بم؟ بەسەرکەوتنی خۆم ئازار بچێژمو لەشوێنێ پەکم بکەوێو بوەستم؟

ئاخر مەگەر من نەبووم دەمێکە سۆراغی ئەو دەڤەرەم گرتووە، کە شنەی شەماڵی تیادا لە هەموو جێیەکی دی بەتەوژمتر هەڵدەکا؟ لەو دەڤەرە ئارامو





بێبەرهەمە نیشتەجێ بووم، کە هیچ کەسێك ناچێتە ئەوێ؟ ئاخر نە من خەڵك و خوا و کوفر و ئیمانم یەکسەر لەبیر بردووە تا لەتارماییەکی سەرگەردانی کەناری بەستەڵەکە کوێستانیە بەرزەکان زیاتر نەبم؟

ــ ئەی دۆستانی دێرینی من! دەبینم کە ئێستا لەرزەیەك لە خۆشەویستی ڕەنگی لەبەر ڕووان بڕیون. نا! ئێرە جێی ئێوە نییە. وەرن بابێ ڕك و کینە لەیەك جیاببینەوە، ئێوە لەم دەڤەرەی بەستەڵەك و بەردەڵانە کە تایبەتە بەڕاوچی و گیاندارانی کێویی کوێستان، ناتوانن پەلە نەکەن.

بەڵام من لەمێژە ڕاوچیی ئەم کوێستانەم. ببینن چۆن کەوانم هێندەی ڕایبکێشم مکوم بووە! ئەم ژێیە مکومە، نیشانەی خواستی مکومی منە. ماڵوێران خۆتان! چونکە ئەو تیرەی لە کەوانی مندایە لەهەموو تیرێك ترسناکترە. ئادەی! ڕاکەن! بۆ ئەوەی خۆتان دەربازکەن ڕاکەن!

پشتتان لەم خۆرە کردووە کە بڕۆن؟ ئەی دڵی من، نووکە ئیتر ئاسوودە بە! ئەوانەی کە بێتوانا بوون ڕۆیشتن. ئێستا ئیتر ڕێگای ئومێد ئاواڵایە، چونکە دەتوانی دەرگاکان بۆ پێشوازیکردن لەدۆستانی تازە بەکراوەیی بهێڵیەوە. لێبگەڕێ با دۆستە کۆنەکان بڕۆن، ئەوان هەر لەبیریش کە. ئەگەر بەڕاستی بوویت بەلاو، پەیوەندی بەلاوانەوە بکە.

تەنها ئومێدێك هەیە کە هێشتا ئێمە پێکەوە گرێ دەدا. کێیە ئەو هێڵە کاڵبووەوانەی کە ڕۆژگارێك بەدەستو پەنجەی خۆشەویستییەوە نووسرابوون بخوێنێتەوە؟ ئومێدی ئێمە وەکو کۆنە کاغەزی زەمانی بەرێیە کە پەنجەکانمان لەترسی ئەوەی نەکا ون بێ، توند دەیگوشێ.

لێرە ئیدی دۆستانی من نین. چی بڵێم؟ تەنها تارماییگەلێکن لەدۆستانی من کە هەندێ جار لەتاریکایی شەودا ڕووبەڕووم دەبنەوە. تاوێ تەماشام دەکەن، ئینجا دەڵێن: "نە هەڵەیەك ڕووی نەداوە، ئێمە خۆمان بووین!". ئۆی! ئەمە چ قسەیەکە!

ڕۆژگارێك ئێوە بۆنی گوڵاوتان لێدەهات، لێ هەنووكە وەكو گوڵە ژاكاوەكان بێگیانن.
ئەی خەونو خەیاڵی لاوێتی، هیچ كەس گوزارشتێكی شایستەی لەتۆ نەخستەڕوو. ئەوانەی كە من بەدوایاندا دەگەڕام، ئەوانەی كە پێموابوو چونكە لەگۆڕاندان سیمای خۆیان ناگۆڕن، تەنها پیر دەبوون. ئەمانە چۆن بەكەسە نزیكەكانی خۆم دابنێم؟ كەسی من تەنها ئەو كەسەیە، كە روخساری خۆی دەگۆڕێ، بەڵام پیر نابێ.
ئەی نیوەڕۆی ژیان، ئەی لاوێتیی دووەمین، ئەی باخی هاوینەیی! ئەی شادمانیی نیگەران، رابە و گوێ بگرە: من شەوو رۆژ چاوەڕێی دۆستە راستەقینەكانی خۆمم.
چاوەڕێی یارانی تازەم، ئەی دۆستانی تازە، وەرن چونكە كاتی هاتن هاتووە.
* * *
سروودی من كۆتایی هاتووە. ئاوازی نەرمو نیانی هەوەس لەسەر لێوانم خامۆش بووە، ئێستا ئیتر تەنیا نیم، جادووگەری كوێستان لێرەیە. یاری نیوەڕۆی من، دۆستێك كە لەدێرزەمانەوە بەدوایدا دەگەڕیام لێرەیە. نا، نا! ناوی ئەوم لێمەپرسن، هەر ئەوەندە بزانن كە ئەوە! نیوەڕۆ بوو كە هاتە لام، نیوەڕۆ بوو كە من یەكێك بوومو بووم بەدووان. بەزمی شادیی خۆم، بەزمی شادیی شادییەكانم گێڕاوە، چونكە... چونكە ئێستای زەردەشت لێرەیە، زەردەشت. میوانی میوانان، زەردەشت، یاری یاران لێرەیە! هەنووكە ئیتر لاوێتی بزەی لەسەر لێوانە. پەردەی رەش دڕیاوە، ئیتر رۆشنایی وتاریكی ئاوێتەی یەكدین...

## سیلس ماریا

دانیشتبووم و چاوەڕوان، لێ چاوەڕوانی هیچ شتێك نەبووم ــ لەودیوی چاكەو خراپەوە بووم. هەندێ جار لەگەڵ رووناكیو هەندێ جار لەگەڵ تاریكیدا یاریم دەكرد. هەرچی هەبوو بۆ من یاری بوو، یان دەریا بوو، یان نیوەڕۆ بوو، یاخود گوزەشتی بێئامانجی كات.



ئەو كات، ئەی دۆستی من، ئەو كاتە بوو كە لەناكاو یەكێك بوو بەدووان ــو زەردەشت لەبەرامبەری مندا تێپەڕی...

## سترانی مەستی

هۆی پیاو، شیار بە! بشنەفە كە شەوی تاریك چ دەڵێ:" خەوتبووم، خەوتبووم ــو نووكە لەخەونێكی قووڵ وەئاگا هاتووم: دنیا قووڵو بێبنە، چونكە لەڕۆژ قووڵتر بیر دەكاتەوە. ئازاری ئێوە زۆرە ــ بەڵام شادی لەئازاری سەر دڵی ئێوە قووڵترە.
ئازار دەڵێ: چاو بپۆشە ــو بەم وێناكردنە شادی هاوشانی ئەبەدیەتە ــ چونكە لەناخەوە داوای ئەبەدیەت دەكات".
ئەمەیە ئەو سروودەی كە زەردەشت خوێندی!





## خامۆشیی ئاسنین

(١)

پێنج گوێ ئامادەی بیستنن‌و هیچ دەنگێك نازرینگێتەوە! دنیا لاڵ بووە... بەگوێی کونجکۆڵی خۆم وەدوای دەنگێك کەوتم.

پێنج جار بەدوای یەکدا قولابم هەڵداو پێنج جار ماسیەك چییە پێوە نەبوو... گوێم هەڵخست... لەنێو تۆڕی ماسیگیریی مندا، هیچ دەنگێك وەڵامی نەدایەوە. بەم شێوەیە، من بەگوێی ئەڤینەوە ئامادەی بیستن بووم.

(٢)

سۆراغی ژیانی ئێمە، سۆراغی بەختەوەریی ئێمە لەودیو باکوور، لەودیوی بەستەڵەکەکان، لەودیوی "ئەمرۆ"، لەودیوی مەرگەوە بگرە، چونکە نەلەسەر زەوی نەلەسەر ئاو، لەهیچ جێیەك ڕێگای بەرەو وڵاتی بەختەوەران نادۆزیەوە:

ئەمە قسەیەکە کە پیاوێکی ژیر بە ئێمەی گوت.

(٣)

ئیدی هیچ شتێك بۆ بەرزاییەکان ڕامناکێشێ، چونکە ئەو بەرزاییانەم باش ناسیون، دەیانناسم‌و خوازیاریان نیم، خوازیاریان نیم، چونکە لەو بەرزاییانە ئیدی ناتوانم چاو بۆ سەرەوەتر هەڵبڕم، ناچارم سەیری خوارەوە بکەم و وەك ئەو ڕۆحانیانەم(*) لێبێ کە تاوانباران پاك دەکەنەوە، ئاخر هەموو ئەوانەی خوازیاری بەخشینن، ڕوویان لەخوارەوەیە.

(*) مەبەست لە ڕۆحانی، پیاوانی ئایینییە.



(٤)

هەرچیەکم هەبوو بەخشیم. داراییەکانم بەخشین.. ئاساییشیشم هەروا. ئیتر بێجگە لەتۆ، ئەی ئومێد، چم بۆ نەماوەتەوە.

(٥)

پاشماوەی ئەستێرە وێرانبووەکانیشم بۆماوەتەوە، و من لەو ئەستێرە وێرانبووانە، دنیایەکی تازەم چێکرد.

(٦)

وای! یادی بەختەوەری بەخێر کە لەو بەرزاییانەدا هەمبوو. ئەوەی کە ئێرۆ مایەی بەختەوەریی منە، سێبەری خۆی بەسەر ڕۆشنایی ئەو بەختەوەرییەی جاران داکێشاوە.

(٧)

چ چاڵێکی ئارامبەخش! ئەوەی کە لەزمانی ئەوانی دیکەدا پێیدەگوترێ ئەستێرە، لێرە گۆڕاوە بۆ پەڵەیەکی تاریك.

(٨)

ئەگەر بتەکان تێکبشکێنی، کارێکت نەکردووە، ئەو کاتە بەڕاستی کەسێکی ئازا دەبیت، کە خووی بتپەرستیت لەناخی خۆتدا لەنێو بردبێت.





(٩)

پیاوانی مەزنو رووبارەکان، بەباریکەڕێیاندا رێگای خۆیان تەی دەکەن، بەڵام روویان لەئامانجی خۆیانە، ئەمە گەورەترین جیلوەی ئازایەتیی ئەوانە، چونکە نیشاندەدەن کە ئەوان لەرێگا پڕلەپێچو سەختەکان ناترسن.

(١٠)

ئەمەیە خواستی منو لەودەمەی ئەم ئیرادەیەم کردووە هەرچییەکم گەرەك بێ لەبەردەستمە. ئەمە دوایین نیشانەی ژیریی من بوو: خوازیاری ئەوەبووم کە پێیدەگووترێ "دەبێ"، بەناچاری پێمنایە سەر "دەبێیەکان"و لەوەبەدواوە ئیدی هیچ "دەبێ"یەکم لەسەر رێگای خۆم بەدی نەکردووە.

(١١)

چی بووە؟ ئایا رووپێوی دەریا هاتۆتە خوار؟ نا! وشکایی زیاتر بووە، چونکە گەرماییەکی نوێی لەخۆدا بەدی کردووە!

(١٢)

ئێوە ئەی شەپۆلەکان، ئەی شەپۆلە تێکچڕژاوەکان، چما ئاوا بەتووڕەیی هاوار دەکەن؟ چ رکوکینەیەکتان بەرامبەر من لەدڵدایە؟ دروستە من بەسەوڵ سنگی ئێوە شەق دەکەم شەقی دەقەم، تا بۆ پێشەوە بچم، لێ ئەوە ئێوە خۆتانن کە بەجووڵەی خۆتان بەلەمەکەی من بەرەو ئەبەدیەت دەبەن!



(١٣)

هۆشمەندایەتیی من هەڤڕکیی لەگەڵ خۆردا دەکرد. دەمویست شادیی خۆر بم، بەڵام بوومە مایەی تێڕامانی ئەو: تیرێژی حیکمەتی من دیدەی ئەو شەمشەمە کوێرە شەوکوێرانەی نابینا کرد.

(١٤)

دیسان لافاو دەخرۆشێ... بەڵام هەنووکە ئیدی باکت، چونکە گەنجینەی هۆشی زەرتەشت، بلێسەدارو بێدەنگ و قورس، بەسەر کێڵـگەو مەزراکاندا ئاوێزانە.

(١٥)

شنەبایەك هەڵدەکات دەبێتە مایەی ئازاری من. بەڕاست مەگەر من ئاوێنەم کە ئاوا بەنەفەسێك رەش هەڵگەڕێم؟

(١٦)

دەبێ بگەڕێیتەوە نێو کۆڕی خەڵکی، لەنێو خەڵکدا مرۆڤ مشتومالْو مکوم دەبێ، بەڵام گۆشەگیریو تەنیایی، مرۆڤەکان سستو گەندەڵ دەکات.

(١٧)

لەجەنگدا، بنچینەی هەمووشتێك، فریودانی دوژمنە. بمەوێ یان نا زرێی شاراوەی من ئەو پێستە رێویەیە کە کردوومەتە بەر.





(١٨)

تەنانەت گورگێك بەقازانجی من گەواهی داو گوتی: ((تۆ لەخودی ئێمەی گورگیش باشتر دەلوورێنی!)).

(١٩)

ئایا بەڕاستی ئێوەم خۆشدەوێ؟ بەڵێ، وەك چۆن سوار پێڕۆکەی خۆی خۆشدەوێ، چونکە پێشڤەچوونی خۆیو گەیشتن بەئامانجەکانی لەوەوە دەزانێ.

(٢٠)

مرۆڤ، ئەو شتەی کەنیەتی و پێویستی پێ هەیە، دەبێ بەهەر نرخێ بێ وەدەستی بێنێ. لەبەرئەوەیە کە من ویژدانێکم بۆخۆم فەراهەم کردووە.

(٢١)

هەقیقەت ـــ وەك ژن وایە و زیاتر نییە. فێڵبازە، چونکە بەتەنگ "پاکیزەیی" خۆیەوەیە. ئەوەی کە خۆشیدەوێ، لەژێر پەنجەکانی خۆی دەیشارێتەوە، چونکە پەنجەکانی خۆی دەشارێتەوە، بەڵام بەئاشکرا قسەیەکی لەبارەوە ناکات، هیچ زانیارییێکیش ناخاتەڕوو. وەکو ژنان، تەنها رادەستی هێز و دەسەڵات دەبێت، کەوایە، بۆ ئەوەی بیخەیتە ژێر رکێفی خۆتەوە، هێز بنوێنە. ئەی ژیرترین مرۆڤ، تادەتوانی سەختتربە تاکو ئەو "هەقیقەت"ە پاکیزەییە ناچار بکەیت ملکەچو پەیڕەویت لـێبکات... ئەو بۆخۆشبەختبوون، پێویستی بەهەستکردن بەهێز و دەسەڵات هەیە.

مەگەر نەمگوت کە هەقیقەت وەك ژن وایەو زیاتر نییە؟



(٢٢)

ئەو پشیلە لەبەرد داتاشراوو قوڕسانەی کە خوایانی چاخە سەرەتاییەکان بوون، هێشتا لەجێی خۆیان وەستاون. چۆن دەتەوێ سەرنگوونیان کەیت؟

(٢٣)

وەك تۆپەڵەخۆریك وایە لەبان قەدپاڵێکی پڕ بەفردا، لەڕاست مرۆڤ میهرەبانە، لەڕاست سروشتیش.

(٢٤)

تۆ کە سەرت لەمەتەڵان دەردەچێ، مەزەندە بکە و هەڵیبێنە کە ئێستا پاکیزەیی من لەکوێیە؟

بەرلەئێستا لەپێش منەوە رایدەکرد، رایدەکرد چونکە لەفێڵبازیی من کە خەریکی نانەوەی داو بووم، دەترسا.

(٢٥)

هەرگیز هاودەمیی دێو مەکە، چونکە بەزەییو مێهری دژوارە، هاوئامێزی عاشقانەشی جەستەت تێکدەهاڕێ.

(٢٦)

ئێژن: خوای ئێوە خوای خۆشەویستیە؟ بەڕاست ئایا پەشیمانیو ئازاری ویژدانیش کە هەمیشە باسی دەکەن، بەنوقرچکەی خواو خۆشەویستی دەزانن؟





(٢٧)

ئەندیشەی من هێشتا لەنێو ژیلەمۆی ڕوونی گڕکانی خۆیدا گەرم و لەهەڵچونادایە. بەڵام هەر ژیلەمۆو زوخاڵی گڕکانێك دواجار حەسارێك بەدەوری خۆیدا چێدەکات، هەر ئەندیشەیەکیش دواجار لەژێر یاساو ڕێو شوێنەکانی خۆیدا کپ دەبێ.

(٢٨)

کاتێك کە هیچ دەنگێکی تازە، قسەیەکی تازەی نەگوت، ئێوە هاتن بەو شەو گوزارەی کۆن، یاسایەکی نوێتان داهێنا: پێوەر ئەوەیە کاتێ کە هەقیقەتی ژیان لەنێوچوو، پەیکەری یاسا قیت دەبێتەوە.

(٢٩)

هەر شتێکی لەدەوروبەری ئێوەدایە درەنگ یا زوو دەبێتە خودی ئێوە. ئینجا نۆرەی نەریت دێت، چونکە هەرجێیەك کەماوەیەکی درێژخایەن تێیدا دانیشی، دواجار بۆگەن دەبێ.

(٣٠)

ئایا بەهێزی؟ بەهێز وەکو کەر؟ یان بەهێز وەکو ...؟[1]

ئایا لەخۆ بایی؟ هێندە لەخۆ بایی کە لەبێهوودەیی خۆت شەرم داتنەگرێ؟

(٣١)

بۆ دوور بڕوانە، بەڵام بۆ دواوە نا! ئەو کەسەی کە بیەوێ پەی بەڕازی هەر قووڵاییەك ببات، سەرەنجام ڕەوانەی قووڵاییەکان دەبێ.

---

(١) وەرگێری فارسی ئەو دێڕەی وەرنەگێڕاوە(Bist du stark? Alse Esel? Stark also gott?).



(٣٢)

پەلاماری من مەدە، کە چما نوستبووم: ماندووبووم، لـێ نەمردبووم.

دەپرسی بۆچی دەنگم ئاوازێکی ئاوا کپی هەبوو؟ لەبەر ئەوەی لەخەودا هەناسەی قووڵم هەڵدەکێشا. نەوای ماندوێتی بوو، بەڵام پێشوازییێك نەبوو کە لەمەرگ بکرێ.

(٣٣)

ئەم دوا بەربەستە، ئەم بیرەی "بیرکردنەوەیە" کێ بۆ خۆی دروستی کردووە؟ ژیانە کە خۆی بەربەستی گەورەی خۆی هێناوەتە ئاراو ئێستا وەرەو ببینە کە لە سەرەوەی ئەو بەربەستە، دەستی کردووە بەقەڵەمبازدان.

(٣٤)

بەرەو بەرزایی بڕۆن، ئایا ڕاستە کە ئێوە "پیاوانی مەزن" هەمیشە ڕووەو بەرزایی دەڕۆن؟ بەڵام ببوورن، ئایا ئێوە لەو گوللانە ناچن کە بەرەو سەرەوە هەڵدرابن؟ ئایا ئێوە کە بۆ بەرزایی دەچن لەبەر ئەوە نییە کە دەزانن هی ئەو نزماییانەن.

(٣٥)

هەر بارێکی گرانت کە لەسەر شانە فڕێی دە. لەبیری کە! چونکە هونەری لەبیرکردن هونەرێکی خوداییە.

پێخۆشە بفڕی؟ گەرەکتە مەحرەمی بەرزاییەکان بیت؟ ئەگەر ئەوەت دەوێ هەرشتێکی قورسە لەلات فڕێیدە نێو دەریا، ببینە ئەمە دەریایە. خۆت هەڵدە نێو دەریا!

ئاخر هونەری لەبیرکردن هونەرێکی خوداییە...

(٣٦)

داد! نەکەی پیاوی سەرکەش لەنزیکبوونەوەی مەترسی ئاگادارکەیتەوە، چونکە بەئاگادارکردنەوەی ئەو، رەوانەی هەڵدێری دەکەیت.

(٣٧)

بۆ کوێ دەچوو؟ دیارنییە! بەڵام گومانی تیا نییە کە لەو رێگایەدا ون بوو. ئەستێرەیەك بوو کە لەنێو بۆشایی ئاسمانەکاندا کوژایەوەو ئێستا ئیدی لەو بۆشاییەدا هیچ شتێك نییە..

(٣٨)

چما خۆی لەو بەرزاییەوە فڕێدایە خوارێ؟ چ شتێك ناچاری کرد وا بکات؟

دڵی بۆ هەموو ئەوەی کە لەو خوارەوە بینی سووتابوو: نووکە ببینە کەوا تێکشکاوو بێگیانو بێکەلك کەتوو.

(٣٩)

بەم زووانە خودییەتی خۆی بانگ کردووە. هەر ئاوا زوو ماندوو بووە، هەر ئاوا زوو دەچێتە سۆراغی ئەو رێگایانە دەگرێت کە پێشتر پێیاندا تێپەڕیوە.

ئەگەرچی ئەو لەڕابردوودا چەندە ئەو رێگایانەی خۆشدەویستن کە پێیاندا رەت نەببوو.

(٤٠)

خۆی سوتاندو بووە خۆڵەمێش. نەك لەنێو ئاگری ئیمانی خۆیدا، بەڵکو لەبەرئەوەی کە ئازایەتیی نەبوونی ئیمان لەخۆدا بەدی نەکرد.



(٤١)

بۆ رزگاربوون لەهەموو ئازارێك تەنها دوو رێگا هەن، کامەیانت دەوێ هەڵیبژێرە:

مەرگی خێرا، یان عەشقی درێژخایەن.

(٤٢)

مرۆڤە بچوکەکان، چ مرۆڤ گەلێکی نازەنینن، رەفتاریان دڵسۆزانەیە و خوێنیان گەرمە. تەنها دەرگای خانووەکانیان نزمە، چونکە لەکەسە بچوکەکان بترازێ کەس هاموشۆی ماڵەکانیان ناکەن.

(٤٣)

دەتەوێ ئەوان دەستەمۆی خۆت کەی؟ وا قسەیان لەگەڵدا بکەیت کە لەگەڵ مەڕی ونبوودا دەکرێ؟ بڵێ: "ئاگاداربن! رێی خۆتان ون کردووەو بەپێچەوانە دەڕۆن".

دەبینی کە ئەوان بەدواتدا دێن، چونکە بەو قسەیە هەستی خۆ بەزلزانی ئەوانت رازی کردووە. بەدواتدا دێنو بەهێمنی بەخۆیان دەڵێن: "سەیرە! کە وابوو دیارە ئێمە رێگایەکیشمان هەبووە؟ بەڵێ! ئاشکرایە کە هەنووکەش رێگایەکمان هەیە!".

(٤٤)

نیگایەکی لێبڕاوانەو داخراو، زیاتر نارۆشن ــ وەها نیگایەك مایەی شانازیی ئەو کەسەیە کە دەبینێ روونو ئاشکرا سەیری ئەوی کردووە.

(٤٥)

گەرەکتە دڕکان بڕنیەوە؟ وریابە پەنجەکانت بەخوێندا نەیەن. بۆچی خەنجەرێك ناگریە دەست؟

(٤٦)

ئایا ئێمە هەموومان وەکو ئەسپی پەرێشانو تاساو نین؟
لەسێبەری خۆمان، لە سێبەری ژوور سەرو ژێر پێی خۆمان نارەوینەوە؟
بێژە کە بمانبەنە رووناکایی، بەلاّم پشتمان لەخۆرەتاو کەن...

(٤٧)

کاتێ کە مرۆڤی گۆشەگیر دووچاری ترسی گران دەبێ، کاتێ کە دەڕواو رادەکا، رادەکا بێئەوەی بزانێ بۆ کوێ دەچێ، کاتێ کە لافاو لەدوایەوە دەنەڕێنێو بروسکەو هەورەتریشقە لەپێشیەوە چەخماخە دەدەن، کاتێ کە دوکانی پڕتارمایی، نوقمی ترسو هەراسی دەکات.

(٤٨)

تا ئەو رادەیە کونجکۆڵێت؟ دەتوانیت سەیری ئەو دیوی دیوارەکان بکەیت؟
پێتوانییە بۆ ئەم کارە پێویستە پشتەسەریشت چاوی پێوە بێ؟
ئاوا زوو وەجووڵە کەوتووە، هەنیشکی خۆی نائومێدانە لار کردۆتەوە. دەنگێکی لەرزانو نیگاشی تێکەڵی هەراسانییە.

(٤٩)

عارەبی سارانشین ئێژێ: "تەنانەت دووکەڵیش سوودێکی هەیە"و من لەدووپاتکردنەوەی ئەو قسەیە دەڵێم: بەڵێ! مەگەر تۆ ئەی دووکەڵ ڕێبواران ئاگادار ناکەیتەوە کە ڕەشماڵی میوانداری لەم نزیکانەیە؟



(٥٠)

ریڤینگێکی ماندوو کە حەپەحەپی سەگێك پێشوازیی لێدەکات..

(٥١)

ئایا شکەستەنی هەی؟ ئەگەر وای، خۆت لەدەستی منداڵان بپارێزە، چونکە منالّ ئەگەر شتێك نەشکێنێ دڵی داناکاسێ.

(٥٢)

ئایا منو تۆ بەرامبەر بەیەك بەدبینو ناحەز بووین؟
بەلاّم خۆ ئەوکات مەودایەکی زۆر لەنێوان منو تۆدا هەبوو.
ئێستا کە هەردووکمان پێکەوە لەنێو کوخێکی چکۆلەداینو چارەنووسێکی هاوبەش پێکەوەی گرێداوین، ئایا دیسان هەر دوژمنی یەکدی دەبین؟
بەلاّم ئەوانەی کە ناتوانن لەیەکتر جیاببنەوە، بەهەرحاڵ دەبێ ڕێگایەك بۆ خۆشویستنی یەکتر بدۆزنەوە.

(٥٣)

مرۆڤ ناتوانێ باش بمێنێتەوە مەگەر ئەوەی فەرامۆش بکات. ئەو منداڵانەی کە هەمیشە بیرەوەریی تەمێکردنو سەرزەنشتیان لەزەیندایە، ئاوری ژێرکاو درۆزن دەردەچن...

(٥٤)

ئەم دوایین خزمەتگوزارانەی"خوا"، ئەم دوایین باوەڕدارانەی جیهان، لەدەوری حەوزی چکۆلەی بازنەییدا لەسەر زگ لێڕاکشاونو بەدوای بەرددا عەودالّن. هەست و هزریان تەنها لەسەر ئەوەیە کە هەرچیەك ناکەوێ بیپەرستن.





(٥٥)

ئۆی، ئەو شاعیرانە!

لەنێو ئەواندا ئەسپگەلی چەمووش ببینە کە چەند بێڕەزا دەحیلێنن!

(٥٦)

جوانی شایستەی کییە؟

بەهەرحاڵ بۆ مرۆڤ نییە. جوانی، مرۆڤ لەپشت خۆیەوە حەشار دەدات و ئەو کەسەی کە خۆی لەپەنای یەکێکی دی شاردبێتەوە، هیچ بەهایەکی نییە.

ئازادانە وەرە پێش!

(٥٧)

"دوژمنت خۆشبوێ[1]، لێگەڕێ با ڕێگر بە کەیفی خۆی رووتت کاتەوە"

(٥٨)

هزرە مەزنەکانی تۆ، کە لەدڵەوە دێن‌و هزرە بچوکەکانی تر کە لەمێشکەوە هاتوون ـ ئایا گشتیان هزرگەلێکی چەوت نین؟

(٥٩)

ئەو لە قەفەس راگردووە، ماوەیەکی درێژتر لەوەی دەبوا، لەنێو قەفەسدا مایەوە، ماوەیەکی درێژتر لەوەی دەبوا، لە نیگابانەکەی خۆی ترسا. تەنانەت ئێستاش ترساوو هەراسان بەرێگای خۆیدا دەڕوات. زەندەقی لەهەموو شتێك دەچێ. سێبەری هەر دارهەڵبڕینێك دەیلەرزێنێ.

---

[1] ئاماژەیە بە وتەیەکی عیسا.



(٦٠)

شێر لەنێو دەمارەکانی رۆحیاندایە، بەڵام لەوەش خراپتر، بیریان بیری شێرێکە!

(٦١)

بەقرژاڵ دەچن‌و منیش هیچ حەز لەقرژاڵ ناکەم" ئەگەر بتەوێ بەدەست بیگری، گازت لێدەگرێ‌و ئەگەر فڕێی دەیتە سەر زەوی بۆ دواوە دەڕوا.

(٦٢)

زانستی زانایانی کاروباری دێرینە لەزانستی گۆڕهەڵکەنەکان دەچێ : تەمەنی هەردووکیان تەمەنێکە کە لەنێو تابووت و مشاردا بەسەر دەچێ.

(٦٣)

هەستیان، هەمیشە پەرت‌و پەلایە. عەقڵ و لۆژیکیشیان لەوڕێنەو خەیاڵات بترازێ شتێکی تر نییە.

(٦٤)

دەست لێ نەدراو و تەواو وەستاوە، هەرتەنێ ئەنگوستێکی پێی چەپی، هێندەی هەموو مێشکی من عەقڵ‌و توانای تیایە. لەندەهۆرێکە لەتەقوا، کە بەرگی سپیی پۆشیوە.

(٦٥)

بەڵام دەوروبەری من بەهەقیقەتی تر داگیراوە. هەقیقەتگەلێك کە تاهەنوکە بەزەردەخەنەی گاڵتەجاڕانە نەڕازاوەتەوە. هەقیقەتگەلی توندو تیژانەو کرچ‌وکاڵ‌و بێحەوسەڵە.





(٦٦)

رۆحێکی بەفراوی، بایەکی سارد کە لەلای بەستەڵەکەکانەوە هەڵدەکات، ساردتری دەکات.

(٦٧)

جۆگەلەیەکی راساوو پڕپێچوتاو؟ بەنێو پانتاییەکی پڕ لەزنارو کەڤردا، کە نائارامو بێ ئۆقرە لەنێو گابەردە رەشەکاندا دەدرەوشێو هەڵدەرزێ.

(٦٨)

ئێژی: "ئەو کەسەی کە بەرێی تۆدا دەڕوا، یەکڕاست دەچێتە دۆزەخ". زۆر چاکە، کەوابوو من هەوڵ دەدەم شارێی دۆزەخی خۆم بەپەندو ئامۆژگاریی شیرین فەرش کەم.



## خۆر ئاوا دەبێ

(١)

ئەی دڵی کەساسو تینوو، ئیدی ماوەیەکی زۆر ئازاری تینوێتی ناکێشی، چونکەوا ئێستا شنەیەکی نەرم هەڵیکردووە، هەر لەئێستاوە هەناسەی لێوانی نەناسێك نەوازشی من دەکا. نووکە ئیتر نۆرەی وەرزی فێنکی هاتوو...

خۆری نیوەڕۆی من، گەرمایییەکی چەند سووتێنەری هەبوو. ئەی ئەو بایانەی کە لەپڕدا هەڵتانکردووە، ئەی رۆحە فێنکەکانی دەمە و نیوەڕۆ، کە بەرەو لای من دێن، بەخێر بێن.

هەوایەکی خۆش منی لەخۆ گرتووە ــ شەو بەدزییەوە نیگای لەمن بڕیوەو ناز دەکات. ئەی دڵی هۆشیاری من، هێزت هەبێ، بەڵام مەپرسە "بۆچی؟".

(٢)

ئەی رۆژی ژیانی من! خۆر بەرەو ئاوا بوونەو لەئێستاوە شەپۆلی زێڕینی ئێوارەیی هەموو جێیەکی داگرتووە.

بەرد گەرمایی خۆی دەباتە ناخەوە. مەگەر ئەوە نییە بەختەوەری، کاتی نیوەڕۆ لەسەریدا خەوتووە؟ هەنووکە ئەو بەختەوەرییە وەکو ئەو بروسکە سەوزباوانە لەبان گەرداوی رەشدا خەریکی یارییە.

ئەی رۆژی ژیانی من! بڕوانێ وا ئێوارە داهاتووە. دوایین تیشکی خۆر نیگای چاوەکانتی گەش کردووە. ئەو فرمێسکانەش کە دڵۆپ دڵۆپ لەخوناوی تۆوە هاتوونەتە خوار بوونەتە دانەی مرواری. بەمزووانە، بلێسەی ئەرخەوانیی تۆ، دوایین ئومێدو دوایین بەختەوەریی تۆ بەکپی بەسەر دەریای رەنگپەڕیودا دەخشێو بەرێگای خۆیدا دەڕوات.





(٣)

ئەی ئارامیی ڕۆح، ئەی ئارامیی زێڕین، وەرە، تۆ کە شاراوەترینو شیرینترین دیباچەی مەرگی! بەڕاست ئایا من لەو ڕێیەی کە پێیدا تێپەڕیم، خێراتر لەوەی دەبوایە رابکەم رامکردووە؟ نووکە پێیەکانم لە ڕۆیشتن کەوتوون، لێ هێشتا نیگای تۆ دەبینم، دەیبینم کە تێمڕاماوە.

لەیاریی شەپۆلەکان بترازێ هیچ شتێك لەدەوروبەری خۆمدا بەدی ناکەم. هەرچی پێشتر کێش و سەنگێکی هەبوو، لەنێو دەریای شینی فەرامۆشیدا نقووم بوو. ئێستا بەلەمەکەم بەتەمبەڵی بەسەر شەپۆلاندا هەڵبەزودابەز دەکات. ئەی ئاوەخڕۆشاوەکان، ئەی لافاوەکان، سەیرکەن کە چۆن لەیادکراوم! ئومێدەکان، هەوەسەکان گشتیان نقووم بوونو هەنووکە ڕۆحی من، ئارامو داکاساوە.

ئەی حەوتەمین تەنیایی هەرگیز "دڵنیایی"ی دڵـگیر هێندە لەمن نزیك نەبووەوە، هەرگیز نیگای خۆر هێندە نەرمو ئارام نەبوو ــ مەگەر هێشتا ئەو بەفرو سەهۆڵەی بەسەر دوندی کێوەکانی منەوە بوو، نەدەدرەوشایەوە؟

.. ئێستا بەلەمی سووكو زیوینی من، وەکو ماسییەکی ڕاستەقینە، لەناخی پانتایی بێبندا مەلەوانی دەکات.



# هەژاریی بەتوانا

دەساڵ تێپەڕیوە، کەچی تەنانەت تنۆکێك باران بەسەر مندا نەباریوە، شنەبایەکی فێنك لێینەداوم، شەونمێکی عەشق نەنیشتۆتە سەر دڵم، چونکە لەم دەڤەرە وشکەدا قەت باران ناباریێ...

ئەی هۆشی من، نووکە ئیدی ڕوودەکەمە لای تۆ، تا تکات لێبکەم لەم وشکە ساڵیەدا، وشکی نەکەیتە پیشە. داوات لێدەکەم خۆت ببیتە شنەی گیانپەروەرو شەونمی دڵگیرو بارانی ژیانبەخشی من. جاران فەرمانم بەهەورەکان دەدا کە لەکوێستانەکانی من دوور کەونەوە.. دەمگوت: "ئەی سێبەرە تاریکەکان، دوور کەونەوە، دوورکەونەوە تا هەتاوی زیاترم پێببەخشن!" بەڵام ئەمڕۆ داویان بۆ دەنێمەوە، تا بەڵکو کەمێك بێنە لامو لەدەوروبەرمدا کەمە سێبەرێك چێ بکەن. پێشتر وێڵ بووم بەدوای هەقیقەتی تاڵ، لێ ئەمڕۆ دەستم رووەو هەڵقەکانی زولفی رێکەوتە درێژ کردووە، تا وەك چۆن منداڵێك دەستەخەرۆ دەدرێو لەگەڵ خۆیدا دەیبەن، ئاوا رێکەوت بکەم بەدۆستی خۆمو دەستخەرۆی کەم، ئەمڕۆ ئیتر گەرەکمە میواندار بم، تەنانەت چارەنووس لەخۆم تەرە نەکەمو چزووی پیا نەکەم.

ئەمڕۆ ئیدی زەردەشت دەستی لەسەرسەختیی خۆی هەڵگرتووە، وەکو بایەکی گەرم کە سەهۆڵبەندان دەتوێنێتەوە بۆتە جیلوەی نەرمیو ئارامی. هێشتا لە کوێستانەکەی خۆیدا چاوەڕێیە، بەڵام ئێستا ئیتر لەدوندەکان هاتۆتە خوار. لەبەستەڵەکە نەمرەکان زیاتر هەنگاوی ناوە. ماندووە لێ خۆشحاڵ، وەکو خولقێنەرێ وایە کە حەوتەمین ڕۆژی ئافراندن تەی بکات.

خامۆش! هەقیقەتێك وەکو هەورە رەشەکان بەژوور سەرمەوە لەگوزەردایە. لەدڵی هەورەوە بروسکەیەکی نادیار، شریخە دەدا. هەقیقەت هێواش هێواش لەپلیکانە پانو پۆڕەکان بەرەو لای من دادەکشێ: وەرە! ئەی هەقیقەتی هێژا، وەرە! ئەمە هەقیقەتی





منه. بەچاوانی نیگەران، بەجۆشێکی دڵگیر لێمدەڕوانیێو نیگای وەك نیگای کچانی گەنج سەرنجڕاکێش‌و بزۆزە. وەك بلێی رازی بەختەوەریی منی دەرك کردووە، دەرکی کردووە کە چما ئەمرۆ لەدوندەوە دابەزیوم‌و ئاوا نەرم‌و ئارامم. دەڵێی لەپشت نیگایەوە ئەژدیهایەکی گوڵڕەنگ لەهەمبەر من دەمی لێککردۆتەوە.

خامۆش! چونکە هەقیقەتی من دەدوێ:

ــ ماڵوێران خۆت، ئەی زەردەشت! حاڵت وەك حاڵی کەسێك وایە کە (زەرناب)ی قووت دابێ، دواجار زگت هەڵدەدڕن، تا زێڕی لێدەربێنن!

ئەی زەردەشت، تۆ پتر لەوەی دەبێ بەتوانابی بەتوانای، زیاد لەئەندازە خەڵکی سەرسام دەکەیت‌و تووشی بەخیلیان دەکەیت.

من خۆم لەبەرامبەر نووری سەرنج راکێشی تۆدا، توانای خۆڕاگیریم نییە.

پەنا دەبەمە بەر سێبەرو دەلەرزم. بڕۆ ئەی خاوەن توانا، بڕۆ، ئەی زەردەشت! لەخۆری خۆت دووركەوە!...

پێتخۆشە بەچەنگان ئەو نوورو رۆشناییەی لەخۆت زیادە بەئەوانی دیی ببەخشی، بەڵام نازانی ئەوەی کە بەڕاستی زیادە، خۆتی! ئەی خاوەن توانا، ئاگاداربە، ئەگەر دەتەوێ شتێك ببەخشی، یەکەم خۆت ببەخشە، ئەی زەردەشت، خۆت!

ئێژی: دە ساڵ بووریوەو لەهیچ هەورێکەوە تنۆکە بارانێك چییە بەسەرتدا نەباریوە، هیچ شنەبایەکی فێنك لێینەداوی، هیچ شەونمێکی عەشق نەنیشتۆتە سەر کێڵگەی دڵت. بەڵام چاوەڕێ بووی "کە" تۆی خۆشبوێ؟ کە تۆی، کە تۆی پتر لەوەی خاوەن توانای خۆشبوێ؟ مەگەر نازانی کە گەرمای بەختەوەریی تۆ دەڤەرەکانی دەوروبەری وشك کردوون‌و ئەو زەوییەی کە لەباران بێبەشە لەعەشقیشی بێبەش کردووە؟

نووکە ئیدی هیچ کەس سوپاست ناکات. بەپێچەوانەی ئەوە، تۆی کە سوپاسی وردەخۆرانی خوانی هەست‌و نەستەکانت دەکەیت. من تۆم هەر لێرە ناسی، تۆ کە



هەژارترینی خاوەن تواناکانیت، چونکە سامانی زۆر ئازارت دەدا. خۆت لەفرەبەخشین ماندوو دەکەیت، ئارامیی خۆت ناپارێزی، بایەخێك بەخۆت نادەیت!

دەروونت هەمیشە بەئازارە، ئازاری سایلۆیەکی گەنمگر کە پتر لەوەی گەنم بگرێ، گەنمی تیا بێ، ئازاری دڵێك کە پتر لەوەی خۆشەویستی بگرێ، خۆشەویستی بنوێنێ.

خۆت دەکەیتە قوربانی، بەڵام درەنگە، ئیتر هیچ کەس سوپاست ناکات. ئەی هۆشمەندی بێهۆش، گەر بتەوێ خۆشیانبووێی، دەبێ هەژارتر بیت. خەڵکی تەنێ ئەو کەسانەیان خۆشدەوێ کە ئازار بکێشن. پارووی نان بەوانە دەدەن کە برسین.

ئەی زەردەشت، گەر بتەوێ شتێك بدەیت، یەکەم خۆت بدە.. خۆت بکە قوربانی.

ــ پەندی من دەگوێ بگرە، دەگوێی بگرە چونکە ئەز "هەقیقەت"ی تۆم..

## شکۆی ئارییان

کێ هەیە کە من گەرم کاتەوە؟ کێ هەیە کە هێشتا منی خۆشبوێ؟ دەستی گەرم بخەنە دەستمەوە، دلانێکم بدەنێ کە مەکۆی ئاگر بن. مەگەر نابینن وەکو بانگکراوێك کە پێیەکانی گەرم کەن، لەبان زەوی راکشاوم‌و دەلەرزم؟ ئۆی! سۆزی ژیانی راستینە سەیر سەراپام دەلەرزێنێ. لەژێر تەزووی سەرماو بەستەڵەکدا هەڵدەلەرزم..و لەم نێوەدا، تۆش ئەی ئەندیشە، ئەی ئەندیشەی رووداپۆشراوی تووڕە، منت لەخۆ تەراندووە.

ئەی راوچیی پشت هەوران، ئەی نیگای پڕ لەتەوس‌و توانج کە لەتاریکیەوە تێمڕاماوی، ببینە کە بە بریسکەی تۆ لەپێ کەوتووم‌و توانای رابوونم نییە.

پێچ دەخۆم‌و پەلەقاژە دەکەم. لەدەست هەموو ئازارە جاویدانییەکان دەناڵێنم، چونکە تیری تۆ ئەی راوچییە دلڕەقەکە، ئەی نەناس، ئەی "خودا"، دڵی کون کون کردووم.

تیری خۆت باوێژە، دژوارترو بەتینتر بیهاوێژە، بیهاوێژە تا ئەم دڵە تێکبشکێنێ. چما دەست لەو جۆرە تیرهاوێشتنەی کە بەسووکی هەڵیدەدەیو بریندارى دەکەیت، لێ نایکوژی، هەڵناگری؟ بێژە: بەو نیگا دڵڕەقانەیەی خۆت کە بروسکەی یەزدانی تێدا دەردەوشێو هەرگیز لەبینینی ئازاری خەڵکی ماندوو نابێ، سەیری چ شتێکی تازە دەکەیت؟

تۆ خوازیاری مەرگی ئێمەیت، خوازیاری ئەشکەنجەدانی ئێمەیت، تەنها خوازیاری ئەشکەنجەدانی. بەڵام بۆچی ــ بۆچی، ئەی خوای نەناسی دڵڕەق ئاوا من ئازار دەدەیت؟

ئاخ! ئاخ! دەبینم کە لەنێو تاریکیی شەوێکی ئەنگوستەچاودا، بەرەو لای من دەکشێی. بەڵام چیت لەمن دەوێ؟ قسە بکە! من تێکدەشکێنیو زەجرم دەدەی. ئۆی! پتر لەرادەی پێویست، لە من، نزیك کەوتووی، لێم وەنزیك ئەوتووی تائازارم دەی، برۆ برۆ دەی! لێرە مەمێنە کە گوێ لەهەناسەم بگریت، بەخیلانە بروانیە ناخی دڵمو سیخوڕی بکەیت. ئاخر بەخیلی بەچی دەبەیت؟ دوورکەوە! دوورکەوە! ئەو پەیژەت چما داناوە؟ مەگەر گەرەکتە لەو خانووە بچیە ژوور کە ناوی دڵی منە؟ دەتەوێ پێ بنێیتە نێویو ڕێی نهێنیترین ئەندیشەکانی بگری؟

ئەی نەناسراو، ئەی بێئابڕوو، ئەی دز! بەتەمای ڕفاندنی چیت؟ دەتەوێ چم لەدەست دەربێنی؟ چم بەزۆر لێبستێنی؟ تۆ، ئەی پشکنەری ئەندیشەکانی من، تۆ، ئەی جەللاد، تۆ، ئەی خودا، چیت لێمدەوێ؟ ئایا من دەبێ وەکو سەگێك لەهەمبەر تۆ بەسەر زەویدا گەوز بدەمو بێپەناو کۆمەك، مەستو بێئاگا، عەشقو خۆشەویستیی خۆم بدەمە دەستی تۆ؟

بەڵام چاوەڕوانیەکی بێهوودەت هەیە! گەرەکتە دیسان دارکاریم کەیت بیکە! لێ هەرچی هەیە من نابمە سەگی تۆ. تەنها ڕەنگە ببمە نێچیری تۆ، کە دڵڕەقترین ڕاوچیت! تەنها ڕەنگە لەخۆباییترین یەخسیری تۆ بم، کە ڕێگری پشت هەورەکانیت!





دە قسە بکە، چت لەمن دەوێ! ئەی کەمینگری ڕێ و بانان، ئەی کە دەمامکی بروسکەو بۆرانت هەیە، ئەی نەناس، ئەی خودا، قسە بکە. بێژە: چیت لەمن دەوێ؟

سەیرە! بۆ ئازادکردنم داوای قەرەبوو دەکەیت؟ کەوایە داوای تاوانێکی گەورەم لێبکە، چونکە فیزی من ڕازی نییە باجی تاوانی بچووك بدات. کورتو بەجێ قسە بکە: ئەمەش پەندێکە کە فیزی من پێمدەدا.

ها ها!

خودی منت دەوێ؟ خودی منت دەربەستو یەك دەوێ؟

ها ها!

شێتە! من ئازار دەدەی؟ بەتەمای زەجردانی فیزی منی؟

لەبری ئەمە، عەشقو خۆشەویستیم بدەرێ ــ کێیە کە هێشتا گەرمم کاتەوە؟ کێیە کە هێشتا خۆشیبوویێم؟

دەستی گەرم بخە نێو دەستەکانی من ــ دڵێك بدە بەمن کە مەکۆی ئاگر بێ. خۆت بدە بەمن، بەمنی گۆشەگیری گۆشەگیران، کە لەبەستەڵەکی کوێستانان، بەڵێ لەهەفت تەبەقەی بەستەڵەکی کوێستانان ساردترم، بەمن کە چاوم بەدوای دوژمنانی خۆمەوەیەو ئارەزووی نزیکبوونەوەی ئەوان دەکەم! خۆتم پێ بدە، بەڵێ، خۆتم پێ بدە، ئەی یاخی ترین دوژمنی من.

نا، نا، بگەڕێوە، بەهەموو ئەشکەنجەکانی خۆتەوە، بۆلای ئەوکەسەی کە کۆشەگیرترینی گۆشەگیرەکانو تەنیاترینی تەنیاکانە بگەڕێوە! بگەڕێوە ڕامەکە! گشت ئازارەکانی من ڕووەو لای تۆ دادەڕژێن، دوایین بلێسەی دڵی من لەبەر خاتری تۆ ڕەنگی ئاورینی گرتووە. بگەڕێوە، ئەی خوای نەناسی من، ئەی ئازارو خەمی من، ئەی دوایین بەختەوەریی من!

## شێتێک، شاعیرێک

ئەی دڵی بڵێسەدار، لەم هەوا فێنکە دڵگیرەدا، کە نم نم خوناوی ئارامبەخش، کپو لەبەرچاوان نادیار، ئارام ئارام دەنیشێتە سەری ـ چونکە خوناوی ئارامبەخش وەکو گشت ئارامبەخش‌و نەوازشکەران پێیەکی چوست‌و سووکی هەیە ـــ بێنەوە یاد، بێنەوە یاد کە پێشتر چەند تینووی ئەشکی ئاسمانان، تینووی نمەی خوناوان بوویت، بێنەوە یاد کە لەتاو وشکی‌و شەکەتیی خۆت تینوێتییێکی چەند دژوار ئەوکی گرتبووی، چونکە لەو کوێرەڕێیە بەپووش‌و پەڵاش داپۆشراوەی کە ڕێگای ماڵی تۆ بوو، تیشکی بەسامی خۆری دەمەو ئاوابوون بەنابەدڵی‌و تەنگبینییەوە لەنێو لك‌و پۆپی درەختە ڕەشداگەڕاوەکان لێیدەدایت؟

گاڵتەجاڕانە پێیدەگوتیت: "دەڵێی یەکێکی لەعاشقانی هەقیقەت؟ نا! تەنها شاعیری، ئەو ئاژەڵە فێڵبازو چاوچنۆکەی کە دەبێ بەدوای پاروودا وەك کرم بەسەر زەویدا بخزی‌و هۆشیارانە درۆ بکەی، بۆ فریودانی نێچیر، دێوجامە بخەیتەر سەرت، بخەیەتە سەرت تا خۆت ڕاوبکەیت.

ئەمەیە عاشقی هەقیقەت؟ نا! وەها کەسێك تەنها شێتێکە.. شاعیرێکە. ئەو کەسەی کە دەمامکی لەشێتی پۆشیوەو بەردەوام وڕێنە دەکاو بەڕێگای خوارو ناهەمواردا دەڕوا، هەندێ جار بەسەر پردە درۆیینەکاندا ڕەت دەبێ‌و هەندێ جار لەسەر کۆلکە زێڕینەی ڕەنگاورەنگدا دادەنیشێ‌و هەندێ جاریش لەنێو ئاسمانە درۆیین‌و زەویە درۆیینەکاندا سەرگەردان دەبێ، بێهۆ بەڕێگای خۆیدا دەڕوا و بێهۆ دەوەستێ، وەها کەسێك تەنها شێتێکە، تەنها شاعیرێکە.

ئێژی وەها کەسێك عاشقی هەقیقەتە؟ بەڵام ئەو، نەخامۆشەو نەبێجووڵە، نەخلیسکاوو نەسارد، نەگۆڕاوەو بوویێت بەپەیکەرێك کە کەماڵی یەزدانی هەبێ، نەلەبەرامبەر پەرستگایەکدا وەستاوە تا لەئاستانەی خوایەکدا پاسەوانی بکات.

نا! ئەو دوژمنی ئەو جیلوانەی تەقوایە. خووی زیاتر بەبیابانەکانەوە گرتووە تا پەرستگاکان. وەك پشیلە، فێڵبازو مەکرۆیە: لەهەمموو پەنجەرەیەکدا بازدەدا،



بەبیستنی هەر دەنگێك بەوریایی سەیری دەوروبەری خۆی دەکات، لەهەموو دارستانێکدا لەڕووی چاوەڕوانی‌و هەوەسەوە، لووتی بەرز دەکاتەوە. ئاخ، بریا تۆش بتتوانیبا لەجەنگەلە دەست لێنەدراوەکاندا، لەنێو گیانلەبەرە دڕندە پڕخەتوخاڵ‌و ڕەنگاوڕەنگاکاندا کە جوانیی گوناهیان هەیەو لەسەر لێوانیان شەوق‌و فیزو تینوێتیی خوێنمژی‌و هێزێکی دۆزەخی بەدی دەکرێ، بۆ گشت شوێنێك رابکەیت، بۆ هەر لایەك تاڵان‌و دەستدرێژیی بکەیت، بخزی، درۆ بکەی.

یا وەك ئەو بازە بیت کە بەکاوەخۆو کونجکۆڵانە نیگای خۆی دەبڕێتە نێو خەرەندەکان، لەو گەر داوانە نزدەبێتەوە کە هی خوێنی و دواتر بەرەو لایان شۆڕ دەبێتەوە، خول دەخوات و ڕوەو زەوی دێتە خوار و تا دێ نەویتر و نەویتر دەبێتەوە تا لەپڕ بەجووڵەیەك، بەتەکاندانێکی باڵ خۆی هەڵدەداتە سەر بەرخۆڵەیەك، چونکە لەوساتەدا ئەو برسیی پارووی چەورە. گشت بەرخۆڵەو مەڕەکانی گەرەکن، لەگەڵ ڕۆحی هەموو بەرخۆڵان دوژمنە، لەئاست هەرچییەك کە نیگایەکی بەرخئاساو زوڵم لێکراوانە و لاوازی بەرخانەی هەبێ، دەرهەق هەرچی لایەنداری‌و هەستی بەرخدۆستانەی تیابێ، رك‌و کینەیەکی لەئاشتینەهاتووی هەیە!

دەبینی، هەی شێتە، هەی شاعیر، کە هەواو هەوەسەکانت یا هەواو هەوەسی هەڵۆن یا هی پڵنگ، هەمان ئەو هەواو هەوەسانەن کە تۆ هەزار دمامکت بەسەر داکێشاون تا لەتووڕەیی خۆتیان وەشێری!

ئاخ! تۆ کە مرۆڤی، تۆ کە هەم خوای‌و هەم بەرخۆڵەیەکیشت لەورگدا جێ کردۆتەوە، خوا لەنێو بوونی خۆتدا پارچە پارچە کە، بەرخۆڵەکەش هەروا، پارچە پارچە یان کەو پێبکەنە، چونکە بەختیاریی تۆ، بەختیاریی پڵنگ‌و هەڵۆ، بەختیاریی شاعیرو شێت هەر ئەوەیە چیی دی نا.

هەیڤۆکی مانگ لەئاسمانی ساوو زوڵاڵدا، وەکو کەشتییەکی سەوزباو، کە لەدەریایەکی ئەرخەوانیدا سنگی ئاو شەق دەکا، بەدەرکەوتووە. ئەو دوژمنەی خۆرو تیشکی هەتاو، ئیرەییانە دەکشێ‌و ڕێگای خۆی تەی دەکات، بەهەنگاوی کپ‌و





دزانە، لەچۆمەڵانەکان تێدەپەڕێ ــ تێدەپەڕێ تا بوارێك وەدەست بێنێ‌و ئەوان تەواو بسپێرێتە دەستی تاریکی‌و مەدهۆشی.

ئەزیش رۆژگارێك وەها، بەهەمان شێوە لەدوندی راستیخوازی‌و رۆشنویستیی خۆمەوە هاتمە خوار، چونکە لەڕۆژ ماندوو ببووم، رووناکی نەخۆشی کردبووم. ناچار نزیك ئێواران کەوتمە داوی تاریکییەوە.

ئەی دڵی داگیرساو کە شەکەت‌و وشك‌و تینووی، ئایا هێشتا وەبیرتە، وەبیرتە کە ئەو دەمانە چەندە تینوو بووی؟ ئاخ! ئاخ! خۆزگە لەمە بەدواوە ئیتر لەهەمووی راستیەکان دوور بام، ئیتر لەشێتێك زێتر لەشاعیرێك زێتر نەبام!

## لەنێو کچانی بیاباندا

.."ئینجا رێبوارەکە کە ناوی تارمایی زەرتەشت بوو، وتی: "مەڕۆ، لەگەڵ مەدا وەمێنە، چونکە گەر تۆ نەبیت جارێکی دی خەمی گرانی کۆن دێتەوە وێزەمان.

لەمێژە جادووگەرێکی پیر کاڵای نائۆمیدی قەرزی خۆی بەئێمە ساغ دەکاتەوە.

سەیری ئەو رێبەرە پارێزکارە بەساڵاچووە بکە، کە چاوانی تژی ئەشکەو هێشتا هەناسەی تازە نەکردۆتەوە دیسان بۆ سەفەر بەنێو دەریای خەمان سواری کەشتی بۆتەوە.

تازە واتێدەگەم کە ئەوانە لەهەمبەری مەدا رواڵەتی باش دەنوێنن‌و خۆ دێننەپێش تا خەم‌و ئازاری دەروونیان وەشێرن، مەرج دەبەستم کە ئەگەر شاهیدێکیان نەبا، ئەوانیش وەکومە جڵەوی خۆیان دەدایە دەستی نائومێدی‌و ئەو یارییە خەماوییەیان دەستی پێدەکردەوە .

- یاریی خەمگینانەی هەورە کۆچەرییەکان، ئاسمانی رەشداگەڕاو، خۆرە شاردراوەکان، بایە بە ناڵە ناڵ‌و خەزانیەکان.
- یاریی خەمگینانەی هاوارو گلەیی نائومێدانەو بە ئێش و ژان.



ئەی زەردەشت لەگەڵ مەدا وەمێنە! نازانی چ ئازارێکی نادیار ناخی ئەم خەڵکەی داگرتووە، کە دەیانەوێ پەردەکە لادەن‌و ناخیان بخەنەڕوو! نازانی هەورە رەشەکان چۆن بەری ئەم ئاسمانەیان گرتووە!

تۆ ئێمەت بۆسەر خوانی پەندو هزرەکانی خۆت بانگکردو خواردنی وزەدارت پێبەخشین. مەهێڵە لەدوماهی ئەم بەزمەدا، چیتر سستی‌و خاووخلیچیمان بەسەردا زاڵ بێتەوەو دیسان لاوازیی ژنانە رووومان تێبکات.

تەنیا هەر تۆی ئەی زەردەشت، کە دەتوانی دەوروبەری خۆت پڕکەی لەوزەو سەفا. لەکوێ هەوایەکی پاکترو باشتر لەهەوای ئەشکەوتە کوێستانیەکەی تۆ دەست دەکەوێ؟

پێتوانەبێ کرچ‌وکاڵانە قسە دەکەم، چونکە لەمێژە بەچوار دەوری دنیادا دەگەڕێم‌و زۆرم دەڤەرو کەش‌و هەوام بینیون، لێ لەهیچ جێیەکدا هەوایەکی وەکو ئەو هەوا پڕ سەفاو خۆشەی کە لای تۆ هەیە نەمدیوە.

تەنێ.. تەنێ.. ئاخ! ئەی زەردەشت من لەبیرکەوتنەوەی بیرەوەرییێکی کۆن ببەخشە، ببەخشە کە ئێستا سترانێکم هاتۆتە یاد، کە رۆژگارێك بۆ کچانی بیاباغم چڕی، چونکە ئەوێ رۆژێ، هەوایەکی دڵگیرو فێنکی رۆژهەڵاتیی پڕلەپاکی‌و وزەم لەهەرێمی ئەو کچانە بەدیکرد. لەو دەڤەرە بوو کە توانیم چەند ساتێك لەئەوروپای پیری تاریك‌و شێدارو خەمۆك، دوور کەومەوە.

لەم رۆژگارەدا دڵی خۆم دایە ئەو کچانەی رۆژهەڵات‌و ئەو دەڤەرە ئارام‌و ئەو ئاسمانە بێگەردو سامالیانە.

نازانن کە ئەو کچانە چەند جوان‌و دڵگیربوون، کاتێ لەسەماو هەڵپەڕکێی خۆیان دەبوونەوە، بەڕوخسارێکی شکۆمەندانە، بەڵام بێئەوەی هیچ بیرو ئەندیشەیەك مێشکیان ماندوو بکات لێیدادەنیشتن. ئەوان لەو مەتەڵانە دەچوون کە بەئاسانی دەشێ هەڵیانبێنی. من ئاوازی نیوەڕۆی خۆم بەشانازی ئەو کچانەی بیاباندا تێهەڵکرد."





رێبوار کە ناوی تارمایی زەردەشت بوو، قسەکانی خۆی کردنو بەر لەوەی کەس دەرفەتی وەڵامی هەبێ، چەنگی پەیامبەری کوێستانی گرتە دەستو ژێرو هێنمانە چاوێکی بەدەوروبەری داهێنا. چوارمەشقی روونیشتو هێند بەشەوقەوە هەناسەی هەڵکێشا، دەتوت دوای ماوەیەك لەدەڤەرێکی تازە، هەوایەکی تازەی دەست کەوتووە. ئینجا دەستی بەژەنین کردو بەسلامەتی کچانی بیاباندا ئەم ئاوازەی هەڵدا:

بیابان فراوانتر دەبێ: ماڵوێران ئەوەی بیابانگەلێکی لەنێو دڵدایە!

ئەها! چەند بەشکۆیە! دەستپێکێکی چەند شکۆدارە کە شکۆیەکی ئەفریقاییانەی هەیە. شایستەی شێرێك، یا هی مامۆستایەکی زانستی ئاکارە. بەڵام لەدیدی ئێوە ئەی دۆستە جوانەکانی من ئەمە هەموو شتێك نییە، لەڕوانگەی منەوە بایەخدارە، چونکە یەکەمجارە، پیاوێکی ئەوروپایی توانیویە لەتەك ئێوەدا، لەژێر لكو پۆپی دارخورماکان دابنیشێ. بەڕاستی کە بالکێشە! لەئاستانەی بیاباندا دانیشتوومو ئاوا زوو لێیدوور کەوتوومەتەوە. هێشتا وشکی سارا کەوەڕێیی نەکردووم، کەچی خۆم بەقوربانی ئەو دەڤەرە دەبینم.

بیابان تازە زاری خۆی کە پڕ بۆنو بەرامەترین زار بوو، بۆ باوێشکدان کردبووەوە، کە من کەوتمە نێویەوەو خۆم لەنێو ئێوە ئەی دۆستە جوانو دڵگیرەکانم بینیوە.

سلاو، سلاو لە ئەونەهەنگە کە ئاوا دڵی بەمیوانەکەی خۆشبوو و خۆشەویستیی خۆی بۆ نواند. هەڵبەت لەئاماژەی زانایانەی من گەیشتوون. سلاو لە ورگی کە ئاوا بوو بەدەڤەرێکی هێند دڵگیر.ـ  گەرچی لەو بارەیەوە دوودڵم - چونکە ئەز لەکیشوەری ئەوروپاوە هاتووم، کە وەك ژنانی بەتەمەن درەنگ باوەڕ دەکاو بەدگومانە. خوا بیخاتە سەر رێی راست !

ئامین!

هەنووکە لەم دەڤەرە فراوانە دانیشتووم، لەدەنکە خورمایەك دەچم کە هەتاو لێیدابێو تۆی شیلەو زەرد وەکو رەنگی زێڕی لێهاتبێو چاوەڕێیی دەمی وەك خونچەی کچێکی گەنج بکا، بەڵام پتر لەخودی ئەو دەمە، تامەزرۆی ددانە ساردو تیژو



بڕەرەکانی بێ، چونکە هەر ئەو ددانانەن کە دەبێ دڵی گەرمداهاتووی ئەو دەنکە خورمایە هەڵبدڕنو بیکەنە قوربانی.

ئەزیش کە لەو میوە باشووریانە دەچم، لێرە لەسەر زەوی لێڕاکشاوم. زیندەوەرە باڵدارە چکۆڵەکان هەستیان بەبوونم کردووە و تێموەرهاتوون. تاسەو هەوەسی سەیری چکۆڵەتر لەو زیندەوەرانە، بەڵام شێتترو گوناهکارتر لەدەورمدا باڵەفڕێیانە. جگە لەوە، ئەی کچانی گەنجی هێمنو چاو پڕلەترس، من خولیای ئێوەم  کە وەك پشیلە مێیینەکانی من وانو ناوتان دۆدۆو زولەیخایە- ئەگەر بتوانم هزرێکی درێژ لەبۆتەی وشەیەکی کورتدا جێبکەمەوە، دەبێ بێژم کە بوونەتە "ئەبولهەول" (خوا لەو گوناهە سەر زارەکیەم ببەخشێ!). ئێستا لەم دەڤەرە هەوایەکی دڵگیر بەدی دەکەم، کە بەڕاستی وەك هەوای بەهەشتە. هەوایەکی رۆشن، سووك بەتیشکی زێڕینەوە، جوانترین تیشکێك کە تا هەنووکە لەمانگەوە داکشابێ. ـ گەلۆ ئایا ئەمە زادەی رێکەوتە، یا وەك ئەوەی پەیامبەرانی بەرێ دەیگێڕنەوە، لەچارەنووسو حیکمەتێکی تایبەتەوە سەرچاوەی گرتووە؟ دڵنیا نیم، چونکە من لەکیشوەری ئەوروپاوە هاتووم، کە وەك ژنانی بەتەمەن درەنگ باوەڕو بەگومانە. خوا بۆ رێگای راست رێنوێنی بکات !

ئامین!

ئەی دۆستانی جوانو دڵگیر، نووکە ئەز لێرە لێڕاکشاوم. جامی لووتی خۆم لەبادەی بۆنو بەرامەی ئەم هەوا خۆشە تژی دەکەم. نەئاییندەیەکم هەیە نەبیرەوەرییێك. چاو دەبڕمە دارخورمایەکی بالأبەرز، کە وەك سەماکەرێك لاردەبێو راست دەبێتەوەو کەمەری خۆی بەشلکی پێچو تاو دەدا،ـ بەچەشنێك ئەگەر ئاوا ماوەیەك سەیری بکەیت، هەوەست دەچێتە لاسایی کردنەوەی- سەماکەرێك کەوای بۆ دەچم ماوەیەکی درێژ، ماوەیەکی زۆر درێژ هەروا لەسەر یەك قاچ وەستاوە ـ پێموایە کە هەر لەبیری چۆتەوە قاچێکی تریشی هەیە. بەهەرحاڵ، دەزانم کە لەخۆوە ماوەیەك لەدوی ئەو هاوکارە بزرە، ئەو دووەمین گەنجینەیە گەڕاوم ـ ئاگادارن

کەمەبەستم قاچەکەی تریەتی ـ واتە لەداوێنی جلە جوانەکانی ئەو سەماکەرە کە لەباوەشێنکەرێکی پڕ چینو پوولەکەدار دەچێ، گەڕاومو هەنووکەش ئەی دۆستە جوانەکانی من، قسەکەم باوەڕ بکەن، کە لەبنەڕەتدا هەواڵێك لەقاچەکەی تریەوە نییە. ونی کردووەو بۆ هەمیشە لەدەستی داوە! مخابن کە ئەو قاچە نازەنینە ون بوو. بەڕاستی ئەو قاچە تەنیایە، کە غەمگینو نائومێد وازی لێهێنراوە، ئێستا دەبێ لەکوێ بێ؟ رەنگە بەهۆی ئازایەتی لەڕادەبەدەری خۆیەوە، لەشێری درندەی یاڵ تێکچڕژاوو لەدێوی خوێنرێژیش نەترسێ. لەوانەشە تا ئێستا خورابێ‌و ئێسك‌و پروسکەکانی جورابن ـ مخابن رەنگە تەنانەت ئاسەواری ئێسکەکانیشی نەمابێ!

ئاخ! ئەی کچانی دڵناسك، مەگرین! ئێوەش دەنکە خورماکان، ئەی مەمکە شیردارەکان، نەیشەکەرەکان، کە بەرێکی وەکو کیسەی چکۆڵەتان هەیە، مەگرین. تۆ، ئەی دۆدۆی رەنگپەڕیو، ئەسرین مەڕێژە، تۆش، ئەی زولەیخا هەوڵدە وەك پیاو بوێر بیت.. بەڵکو بشێم دەرمانی بەهێزکردنی دڵتان بۆ دابینکەم؟ هەر لێرە ئامادەی کەم؟ پەندێکی پیرۆزتان پێشکەش کەم؟ بۆ چاکەکردن پشتتان بگرم؟

ئەی شکۆو مەزنایەتی من، لەجێی خۆت بجوڵێ. ئەی شکۆی مرۆڤی خاوەن تەقوا، ئەی شکۆی ئەوروپایی، رابە. ئەی شنەی ئاکارە جوانەکان بشنێ. ئاخر من دەمەوێ جارێکی کەش بنەڕێنم. جارێکی کەش وەك شێرێکی بەئاکار بنەڕێنم، تا هێزم تێدایە. دەمەوێ لەبەرامبەر کچانی بیاباندا بنەڕێنم، چونکە نووزەنووزی تەقواو چاکەکاری زیاتر لەهەموو شتێك نیشانەی ئەوروپاییەکانە. خۆراکێکە کە دەبێ زگی برسیان دامرکێنێتەوە، جا خۆ ئەزیش ئەوروپاییم. دەتوانم چیبکەم؟

خواوەند یارمەتیم بدات !

ئامین!

بیابان فراوانتر دەبێ. ماڵوێران ئەو کەسەیە کە بیابانگەلێکی لە ناو دڵ دایە!



## لەنێو باڵندە شکارییەکاندا

ئەو کەسەی کە بەتەمای نیشتەجێبوونی ئێرەیە، زۆر زوو دەبێتە قوربانی ئەم کردەوانە. بەڵام تۆ، ئەی زەردەشت، مەگەر خەرەندی قووڵت خۆشناوێ؟ مەگەر لەو سنۆبەرە ناچیت، کە هەمیشە حەز بە دۆڵاییەکان دەکاتو رەگو ریشاڵەکانی خۆی لەوێ دادەکوتێ، کەتەنانەت بەردیش کاتێ لەتەنیشتیدا لار دەبێتەوە لەترسان دەلەرزێ، لەلێواری کەندڕاندا کە هەموو شتێك لەدەوروبەریاندا روو لەغلۆربوونەوەیە، دووچاری دوودڵی دەبێ، لەهەمبەر بێسەبریو نائارامی لافاوە خرۆشاوەکاندا خۆی دەداتە دەستی چارەنووسو هەوڵدەدا هێمنو وریابێ و ئاوا تەنیا دەمێنێتەوە..

تەنیا! لێ داخۆ کێ بێ لێرە بێتە میوانی؟ بێتە میوانی تۆ، رەنگە باڵندەیەکی شکارچی بێ کە بەوپەڕی دڵڕەقییەوە ملی نێچیرە لەپەلوپۆکەوتووەکەی خۆی گرتبێ‌و قاقا پێبکەنێ، پێکەنینی شاهینێکی شکارچی..

بەگاڵتە پێکردنێکی دڵڕەقانە، دەڵێ: ئەو هەموو منجریە بۆ چی؟

ئەوەی کە دۆڵەکانو گەرداوەکانی خۆشدەوێن دەبێ باڵی بەهێزی هەبن. نابێ وەکو تۆ لەنێوان زەویو ئاسماندا بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە!..

ئەی زەردەشت، هەی دڵڕەقترینی نەمرووەکان، کە پێشتر خوات راو دەکرد، تەڵەی تەقواو تیری خراپەکاران بوویت، نووکە خۆت بوویت بەنێچیری خۆت. خۆت بەدوای خۆت دەکەویو دەستکەوت لەخۆت دەگریو خۆت دەکەیتە ئامانجی تیری گیانەنگێو...

ئێستا بەو هەموو فرەزاینەیی خۆت بەتەنێ ماویتەوە. لەگەڵ خۆتدا تەنیا ماویتەوە. لەبەرامبەر سەد ئاوێنەدا وەستاویو خۆت وەك چۆن هەیت نابینی، خۆت بەپەتی خۆتەوە دەخنکێنی، ئەی ئەوەی کە رێی راستی خۆتت دۆزیوەتەوە، ئەی ئەوەی کە جەللادی خۆتی! چما خۆت بەزنجیری زانستی خۆت بەستۆتەوە؟ چما هێشتت بکەویتە داوی بەهەشتی ئەژدیهایەکی پیر؟ چما لەنێو ناخی خۆتدا کەوتیە





کنەکردنی بوونی خۆت؟ نووکە ئیتر بەژەهری ئەژدیهایەکی[*] نەخۆش، نەخۆش کەوتوویت. ئەو زیندانیەیت کە پشتت لەژێر باری خەماندا چەماوەتەوەو لەچاڵی کانزایی خۆتدا سەنگینترین بەرد دێنیەدەر. لەناخی بوونی خۆتدا، بە دەوری خۆتەوە دیوارت هەڵچنیوە، خۆت هەڵدەکەنی و کنەکاری دەکەی و ناشیانە لەم چاڵەدا بەدوای تەرمی مردوویێکدا دەگەڕێی..

لەژێر سەد باری گراندا کەخۆت هەڵتچنیوون، خەریکی لەپەلوپۆ دەکەویت، ئەو لەپەلوپۆکەوتووە تۆی، تۆی و دەشزانی، تۆی کە خۆت دەناسی، تۆی، ئەی زەردەشت، ئەی زەردەشتی زانا!

بەدوای گرانترین باردا دەگەڕایت، خۆتت دۆزیەوە، ئیدی ناتوانی لەخۆت جویێ ببیەوە.

ئێستا وەك ئەو کەسەی کە ئیدی بڕستی راوەستانی نەماوە، لەسەر زەوی لێڕاکشاوەو گوێی بۆ دەوروبەری خۆی هەڵخستووە. تۆ ئەی زەردەشت، رۆحێکی کە شێوەی خۆی گۆڕیوە و روخسارێکی ناشیرینیت بەخۆوە گرتووەو بەلارێدا بەرەو گۆڕی خۆت ملی ریێت گرتووە، لەبیرتە پێشتر بەسواری ئەسپە دارینەکانی غرووری خۆت، چەند سەر بڵندو بەرزەفڕ بوویت! بەر لەم تەنیاییە، بێخوا بوویت، جگە لە شەیتان، شەیتانی فەرمانڕەوای سوورپۆشی مەملەکەتی کوفرو بوێری، هیچ کەست لەتەکدا نەبوو، هیچ کەس!

لێ نووکەـ لەنێوان دوو نەبووندا ئازار دەکێشی. بوویت بە خاڵێکی سەرسوڕمان، مەتەڵێکی هەڵنەهێنراویـ مەتەڵی باڵندە شکارییەکانی! ـ بەمزووانە ئەو باڵندانە، برسیی ئەو رێچارەیە دەبن کە دەبێ تۆ بۆ مەتەڵی بوونی خۆت بیاندۆزیەوە، بەمزووانە لەدەوروبەری تۆدا کە مەتەڵی ئەوانیت، لەشەقەی باڵ دەدەن، لەدەوروبەری تۆدا بەباڵەفڕەوە هاتوون، کە لەنێوان زەویو ئاسماندا بە ئاوا ماونەتەوە!

لەدەوروبەری تۆدا، ئەی زەردەشت، ئەی ناسێنەری خۆت، ئەی جەللادی خۆت!.

(*) ئەفعی: جۆرە مارێکە کە ژەهرەکەی کوشندەیە.





## شانازیو ئەبەدییەت

(١)

لەکەیەوە لێرەی؟ چەند دەبێ ئاوا لەسەر باری ئێش و خەمان دانیشتووی؟

ئاگاداربە، بەری ئەو دانیشتنەی تۆ لەخەمو ئازار بەولاوە شتێك نابێ.

بەڕاست زەردەشت بۆچی لەقەدپاڵی کوێستانەوە بەرەو خوار دەخزێ؟ لەمێژە کە ئەو تووڕەو کپو نیگەران، دەڕوانێتە دەوروبەری خۆی؟ بەڵام لەناکاو برووسکەیەکی ورشەدارو سەرسامکەر لەقووڵایی دۆڵاییەوە روو بەئاسمان شریخە دەداو سەرتاسەری کوێستانەکە دێنێتە هەژان... ئاخ! وا تووڕەییو کینە دەگەڵ گەردەلوولدا ئاوێتەبوونە و بوونەتە نەفرەت. ئێستا تووڕەیی زەردەشت وەکو لافاوێك لەترۆپکی چیاوە بەرەو خوار هەڵیکردووە.

ئەگەر هێشتا رووپۆشێك شك دەبەن، خۆتانی لەژێریا پێداپۆشن!

ئەگەر نوێنگەیەکتان بۆ ماوەتەوە، بچنە نێویەوە، چونکە کاتی ئەوە هاتووە کە گرمەو تریشقەی هەورو برووسکە هەڵبکاو بنمیچو دیوارەکان بێنێتە لەرزە. کاتی ئەوە هاتووە هەورو تریشقە لێبداو ئەو راستیانە رۆشن کاتەوە، کە بۆنی ئاگریان لێدێ، چونکە زەردەشت نەفرەتی کردووە...

(٢)

من ئەو سکەزێڕەی کە لەبازاڕ بەبرەوەو پێیدەگوترێ "شانازی"، بەهیچ دادەنێمو بەنەفرەتو بێزاریەوە دەیخەمە ژێر پێمەوە.

ئەو کەسەی لەپاداشتی هونەرەکەیدا داوای دەستحەق دەکات، کەسێکی بێهونەرە. لێگەڕێ ئەوانەی کە خوازیاری ئەو زێڕو زیوە بازاڕیانەن، با بۆ وەرگرتنی

دەست پانکەنەوە، چونکە ئەو کەسە ئەو زیڕو زیوانە وەردەگرێ، کە خۆی مایەی فرۆشتن بێ.

- دەتەوێ ئەوانە بکڕی؟ وەرە! گشتیان بۆ فرۆشتنن! لێ لەو سەودایەدا نرخێکی گونجاو بێژەو کیسەی پڕ دراوی خۆت راوەشێنە، رایوەشێنە با پارەکانت زرینگەیان بێت، ئەگەر نا مانای وایە دانت بە تەقوای ئەوان داناوە.

مەگەر نازانی کە ئەوان گشتیان کەسانی پارێزکارو بەتەقوان؟ شانازیو تەقوا هەمیشە شان بە شانی یەك دەڕۆن. تا دنیا دنیایە خەڵکی بەشانازی بەهای تەقوا دەدەنو زرینگەی سکەی شانازییە کە دنیا لەسەر پێ رادەگرێ.

بەڵام لێگەڕێ بلا ئەز قەرزاری هەموو پارێزکارانی جیهان بم. لێگەڕێ با لەبەردەم خاوەن شانازییەکانی سەرزەویدا لەکرمێکی بچووك زیاتر نەبم، چونکە هەر لەگەڵ ئەوەی خۆم لەنێو ئەو جۆرە خەڵکەدا دەبینمەوە، دڵم ئارەزووی سووکایەتییێکی بێسنوور دەکات.

من ئەو سکەزێڕەی کە لەبازاڕی جیهاندا بە برەوەو ناوی شانازییە، بە هیچ دادەنێم و بەنەفرەت و بێزاریەوە دەیخەمە ژێر پێم.

(٣)

## خامۆش

ئێستا ئیتر لەبەرامبەر شانازیو پارێزکاری، لەبەرامبەر شتە هیچو چنەییەکان نیم، چونکە هەنووکە رووبەڕووی راستییە مەزنەکانەوە وەستاوم. نووکە ئیتر یان دەبێ خامۆشو بێدەنگ بمێنمەوە، یان قسەی مەزن بێژم، ئەی زانایی، ئەی هزری من، قسەی مەزن بێژە!



سەیری سەرەوە دەکەم: لێك لێك شەپۆلی رۆشنایی بەسەریەکدا دێنو دەچنو تێدەپەڕن. ئەی شەو، ئەی بێدەنگی، ئەی دەنگی مەرگ!.. بڕوانن: لەشوێنی زۆر دوورەوە، ئاگرێکی درەوشاوە ئارام ئارام بەرەو من دێت...

ئەی پێکهاتەی ناوازەی گەردوون! ئەی کۆمەڵە خەونو ئەندیشەی جاویدانی، ئایا ئەمە تۆی رووتکردۆتە لای من؟ بەڵام چۆنە کە جوانیی خامۆشیەکەی تۆ، ئەو جوانییەی کە هیچ چاوێك لەجیهاندا نەیبینیوە، لەبەر چاوەکانی مندا راناکات؟

ئەی رووکاری هەرە بەرزی بوون، ئەی کۆمەڵە خەونی جاویدانی، خۆت لەمن باشتر ئەو رازەی کە سروودی تووڕەیی خەڵكو سروودی مێهرەبانیی منە دەزانی! خۆت دەزانی کە خۆت جاویدانیت، چونکە بوونت پێویستە. ئاگری عەشقی من جاویدانانە بلێسە دەدا، چونکە دەبێ بە بلێسە بێت.

ئەی رووکاریی هەرە بەرزی بوون، ئەی پێکهاتەی ناوازەی گەردوون، کە هیچ ئارەزووێك ناگاتە ئاستانەی تۆو هیچ نکۆڵیێك داوێنی تۆ ئاڵوودە ناکات.

ئەی رووکاری نەمری ژیان، من جاویدانانە لاگیری بوونی تۆ دەبم، چونکە، ئەی ئەبەدیەت، تۆم خۆشدەوێ!.

## نیشانەی ئاگرین

لێرە، لەناو دڵی دورگەدا کە دەڵێن پەرستگەیەکی بەردینە، لەنێو شەپۆڵەکانی دەریادا سەری قووت کردۆتەوە، لەژێر ئاسمانی تاریکدا، زەردەشت ئاگری کوێستانی خۆی کردۆتەوە، ئاگرێکی داگیرساندووە کە بۆ ونبووەکان نیشانەو رێگای دەربازبوونو بۆ ئەوانەیش کە توانای وەڵامدانەوەیان هەس خاڵی سەرسوڕمانە.

بلێسەی سپیی ئاگر، عاشقانە روو لەدووردەست دەکاتو بەرەو بەرزاییە ئارامەکانو هەوای فێنكو دڵگیریان رێ دەکات، دەڵێی مارێکەو بەبێئۆقرەییەوە گینگڵ دەداو پێچ دەخوات.





من ئەم ئاگرە پیرۆزەم لەبەرامبەر خۆمدا داناوە، چونکە ئەم ئاگرە رۆحی منە. مەگەر ئەوە نییە رۆحی منیش هەمیشە ئارەزووی لەئاسۆی نەناسو دوورە دەست هەیەو بەگڕی دانەسەکناوی خۆیەوە تا دێ زیاتر روو لەبەرزایی دەکات؟

بەڵام چما زەردەشت لەپڕدا خۆی لەگیاندارانو مرۆڤەکان دوورخستەوە؟ چما زەویو وشکانی جێهێشتن؟

ئاخر ئەو شەش قۆناغی تەنیایی تێپەڕاندو بە شەش خوانی گۆشەگیریدا رەت بوو، لێ بۆ تەیکردنی حەوتەمین قۆناغی تەنیایی، زەوی لەدیدی ئەودا مەنزڵگەیەکی پووچ بوو. دەریاش کیفایەتی نەکرد.

زەردەشت پەنای بردەبەر دوورگەیەکی لاپەڕگەی ناو شەپۆلەکان. چووە کوێستانو بووە بلێسەی ئاگرو رووەو حەوتەمین گۆشەگیری، کڵپەی دا.

ئەی ونبووەکانی رێی ژیان، ئەی وێرانەکانی پاشماوەی ئەستێرە دێرینەکان، ئەی دەریاکانی داهاتوو، ئەی ئاسمانە تاریکەکان، هەنووکە ئەز بەرەو ئیوە هەمووان، بەرەو ئیوە و هەرچی مەزهەری تەنیایی و گۆشەگیرییە هاتووم، بەرسڤی پەیامی پیرۆزی ئاگر دەنەوە، بەرەو لای من کە راوچی کوێستانە سەرکەشەکانم وەرن و من لە حەوتەمین گۆشەگیری: لەدواپین گۆشەگیریم نزیك کەنەوە!

## ئاوازی شەو

شەوە: قەڵبەزە هەڵبەزیوەکان، بەرزتر لەهەمیشە دەپەیڤنو رۆحی من خۆی قەڵبەزەیەکی هەڵبەزیووە.

شەوە: ئاوازەکانی عەشق لەخەوێ هەستاونو رۆحی من، خۆی ئاوازێکی عەشقە.

لەدەروونی مندا نیگەرانیەکی نائارام هەیەو هەوڵ دەدا دەنگ هەڵبڕێ. تاسەی عەشقێکی شاراوەم لەدڵ دایەو بەزمانی عەشق تێیهەڵکردۆتە ستران.



رووناکیم، خۆزیا تاریکی بام! بەڵام تەنیایی من هێندە سەنگینە کە دەبێ هەروا لەبازنەی رۆشناییدا وەمێنم! بریا لەجێی ئەو رۆشناییە تەنها لەنێو شەوو تاریکیدا دەبووم.. ئەو دەم دەمتوانی سەربنێمە سەر مەمکی رۆشناییو شیری لێبنۆشم. دەمتوانی بۆ ئێوە ئەستێرە چکۆڵە درەوشاوەکان، کە گوڵەستێرە ورشەدارەکانی ئاسمانن، دروود بنێرمو لە رووناکیتان سەرمەست بم.

بەڵام نووکە من لەرووناکیی تایبەتی خۆمدا دەژیم، لەبری ئەوەی بەدوی رووناکیدا بگەڕێم، هەوڵدەدەم ئەو گڕو کڵپانەی کە لەبوونی خودی مندا سەرچاوە دەگرن، دابمرکێنمەوە.

لەگەڵ بەختیاریی ئەوانەی دیاری وەردەگرن بێئاگام، چونکە هەمیشە پێموابووە کە مرۆڤ بدزێ باشترە لەوەی وەربگرێ.

هەژاریی من بەرادەیەکە کە هەردوو دەستم شەوو رۆژ لەبەخشین ناوەستن، بەردەوام بەتاسەی دیداری ئەو چاوانەوەم کە چاوەڕوانن، چاوەڕوانی ئەو شەوانەن کە بەتریفەی هەوەس رووناك بوونەتەوە؟

ئەوانەی کە دەبەخشن، چەند بەدبەختن!. هاوار! ئەی گیرانی خۆری من! ئەی ئارەزووی هەبوونی ئارەزوو! ئەی ئەوپەڕی مگێزی برسێتیو تێری!. ئەوان خەڵات لەمن دەستێنن، بەڵام ئەی من چی دەتوانم لەوان بستێنم؟ لەنێوان دانوستاندا چاڵێکی قووڵ هەیە، بچوکترینی چاڵەکان لەهەمووان درەنگتر پڕدەبێتەوە.

جوانیی من خۆی ئەو برسێتیەی پێبەخشیوم خراپە لەگەڵ ئەوانەدا بکەم کە بەتیشکی خۆم رووناکیان دەکەمەوەو دەست بەسەر دارونەداری ئەو کەسانەدا بگرم کە چاکەم دەگەڵدا دەکەن.

ئەمڕۆ ئاوام دەوێ چونکە تینووی بەدخوازیم.

ژیریم عەودالی تۆڵەیە. بێئۆقرەییم لەپشت پەردەی تەنیاییمەوە سەر دەردێنێ.

ئەو شادییەی کە لەبەخشیندا پێمدەبرا، بەهۆی زۆر بەخشینەوە مرد. ئەو پارێزکارییەی کە هەمبوو، لەبەر زیادەڕۆیی خۆیەوە، لەخۆی تێر بوو. ئەو کەسەی





که هەمیشه دەبەخشێتەوە، مەترسیی ئەوەی لەسەره که ئیدی هەست بەشەرم نەکات.

ئەو کەسەی کەگشت ماڵو دارایی خۆی بداته ئەوانی دی، بەهۆی پێهەڵبڕین لەدابەشیندا دەستو دڵی خۆی له پەل و پۆ دەخات.

ئیدی چاوانی من لەبەر دیداری شەرمنی سواڵکەران، فرمێسکیان تێنازێ. نا ئیدی دەستی من لەبەرامبەر لەرزینی ئەو دەستانەی بۆ سەدەقه پاندەکرێنەوە، نالەرزن.

ئەشکی چاوەکانم بۆ کوێ چوون؟ ئەو جۆشو خرۆشەی لەدڵمدا هەبوو، چی لێهات؟ ئاخ! ئەی تەنیایی گشت بەخشێنەران! ئەی بێدەنگی گشت مەشخەڵەکان! لەبۆشایی ئاسماندا چەند خۆر هەن! بەڕووناکی خۆیان دەگەڵ هەموو سێبەرێك دەدوێن، لێ بۆمن بێدەنگن! ئاخر رۆشنایی هەمیشه دوژمنی مەشخەڵه..

خۆرەکان لەناخەوە دوژمنی مەشخەڵەکانن، لەگەڵ گشت خۆرێکی تریشدا ناکۆکن. خۆرەکان وەکو لافاو بەڕێی خۆیاندا دەڕۆن، چونکه لەو رێگایەوە دەتوانن خۆیان ساردکەنەوە. لێ ئێوەی زادەی تاریکیو شەو، تەنێ ئێوەن که گەرمایی خۆتان لەمەشخەڵەکانەوە وەدەست دێنن. ئاخ! تەنێ ئێوەن که شیری فێنکی لەمەمکی رۆشناییەوە دەمژن.

بەداخەوە که لەهەموو لاوە کێوی سەهۆڵ دەوری گرتووم. سەهۆڵ دەستم دەسووتێنێ. بەداخەوە که من تینوێتییێکم هەیه که تینوێتیی ئێوە داینامرکێنێتەوە.

شەوە، ئاخ! من بۆچی رۆشناییم؟ بۆچی تینوێتیی ئێوارانم؟ بۆچی تەنیاییم؟

شەوە. هەوەسی من وەك شەپۆلێك لەسەرچاوەی بوونمدا سەر هەڵدەگرێو ئەو هەوەسە، هەوەسی وتنه.

شەوە، نووکه ئیدی گشت قەڵبەزه هەڵبەزیوەکان بەدەنگی بەرزتر دەپەیڤنو رۆحی من خۆی قەڵبەزەیەکی هەڵبەزیوە.





شەوە، نووکه ئیدی ئاوازەیلی عەشق لەخەو هەستاونو رۆحی من خۆی ئاوازێکی عەشقە.

ئەمەیه ئەو سروودی که زەردەشت خوێندی.

## دوایین خواست

دەمەوێ بمرم، وەك چۆن پێشتر ئەوم بینی که مرد ـ ئەو دۆستەی سەردەمی تاریکیی لاویم، که وەك خوایەك نیگایەکی بروسك ئاسای هەبوو. قووڵ و کەیلی نائارامی بوو، سەماکەرێکی راستەقینەی مەیدانی جەنگ بوو. لەهەموو جەنگاوەران شادترو لەهەموو داگیرکەران لێبڕاوتر بوو. چارەنووسێکی خستبووه بان چارەنووسی خۆی، سەختو وردو بەتەدبیر بوو. لەهەمبەر سەرکەوتنی خۆیدا دەلەرزی، لەشادیدا هاواری دەکرد که دەتوانێ سەرکەوتنی خۆی لەگەڵ مەرگدا ئاوێته بکات ـ و لەهەمان ئەو کاتەی که دەمرد، دیسان فەرمانیدا، فەرمانی دەدا، فەرمانی دەدا که وێران کەن، هەرچی هەیه وێرانی کەن.

دەمەوێ بمرم، وەك چۆن پێشتر ئەوم بینی که مرد، مرد لەکاتێکدا که سەرکەوتوو بوو و وێرانی دەکرد.

## بۆ خەم

ئەی خەم، تووڕە مەبە ئەگەر بۆ پێهەڵدانی تۆ پێنووسم بخەمەگەڕ، تەنیاو بێدەنگ لەسەر قاپۆری درەختێك روونیشمو سەرم بەسەر ئەژنۆمدا شۆڕ کەمەوە. تۆ زۆرجار ئاوا منت بینیوە. دوێنێش، لەبەر تیشکی سەرلەبەیانی خۆری پڕ لەگەرمیدا، ئاوا بەمشێوه دانیشتنه منت دۆزییەوە،. کەرکەس لەدەورمدا لیبڕاوانه هاواری دەکرد، لەسەر قاپۆری درەختێك هەڵنیشتبووو لەدنیای خەیاڵدا دیمەنی گۆشتی مرداری دەهێنایه بەرچاو.

ئەی پەڕەندەی دڕندە، لەدیداری مندا کە وەك مۆمیایەك لەنێو تابووتێکدا بێهەستو خوست بووم، واتزانی مردووم، نا، نیگای پڕ لەتاسەو هەوەسی منت نەبینی کە لێرەو لەوێ، بەوپەڕی فیزو سەربلّندییەوە، بەدوای شتە تازەکاندا دەگەڕا. هەرچەندە توانای گەیشتن بەو دیوی هەورە دوورەدەستەکانیشی نەبوو کە ماڵو کاشانەی تۆیەو نەدەگەیشتە بەرزاییەکانی تۆ، لێ بەهەمان ئەندازە رۆچووبووە نێو ناخی خۆی، تا بەچەخماخەیەك گەرداوەکانی بوون روون کاتەوە.

ئەی خەم، زۆر جار لە بیابانی بێبنو کپدا وەك ئەو دڕندەیەی هێنرابێتە کوشتارگا، دانیشتوومو هەموو گیانم کەوتۆتە لەرزین وەکو هەوەڵین ساڵەکانی ژیانم، چەشنی دەوەنێکی دڕکاوی نوقمی خەیاڵی تۆ بووم.

لەهەڵفڕینی کەرکەسو لەگرمژنی ئەو رنووە بەفرانەی کە هەرەس دێنن، نوقمی شادیو چالاکی دەبووم، تۆ، تۆ کە ناتوانی فریو بدەی، بەدەنگی لێبڕاو و راستگۆیانەی خۆتەوە قسەت لەگەڵدا دەکردم.

ئەی خواوەندی تووڕەیی زناری کێوی، ئەی دۆستی من، دەبینم کە حەزت لێیە بێیتە نك من و لەتەنیشتم رووینی، دوژمنایەتی کەرکەسو شادیی رنووم کە بە مەبەستی ئازاری من دەخرۆشێ، پێکڤە بۆ بێنی. هەوەسی مرۆڤکوژی هەموو جێیەکی لەدەوروبەری مندا داگرتووە، ئەو هەوەسە سەرکەشە، ئاگایانە هەوڵ دەدا ژیان ناچاری تووڕەیی بکاو لەژێرەوە دنەی دەدا. گوڵ، لە پەنا زناراندا ناز دەکات تا پەپوولە بەرەولای خۆی بانگهێشت بکات.

من ئەمانە هەموویانم. ئەوەی کە پەپوولەی سەرنجڕاکێشو گوڵی بەلادا کەوتووو کەرکەسو سێڵاوی ساردوسڕو ناڵەی لافاوی لەخۆگرتووە، هەست پێدەکەم، هەموویان لەبەر تۆ هەست پێدەکەم، ئەی خواوەندی تووڕەیی کە لەدڵەوە دەتپەرەستمو سەرم خستۆتە سەر چۆکم تا هاواری ستایشکردنی تۆ هەڵدەم. لەبەر خاتری تۆیە کە من لەنێو هەوەسی ژیاندا دەسووتێم.



ئەی خواوەندی ستەمگەر، تووڕە مەبە کە لەسروودەکانی خۆم ملوانکەیەکت لەگوڵ بۆ چێبکەم. ئەو کەسەی تۆ بەڕووی ترش و تووڕەیی خۆت رووی تێدەکەی، لەرز دایدەگرێ. ئەو کەسەی تۆ دەستی بۆ درێژ دەکەی، وەپەلەقاژە دەکەوێ. ئەزیش، لەرزانو پەرێشان، سروود بەدوای سرووددا دەڵێمو هەر سروودێکی کێشداری من، لەرزینێکی تازەی بوونی منە، مەرەکەب لەنووکی خامەوە هەڵدەکوتێتە سەر لاپەڕەی کاغەزو دەنووسێ: ئەی خواوەند، ئەی خواوەند، ئاوام لێگەڕێ، لێگەرێ با ئارام بم!

## دوای لافاوێکی شەوانە

ئەی خواوەندی توورەیی، ئەمڕۆ وەك پەردەیەك لەتەم بەسەر پەنجەرەی ژوورەکەی مندا کشاوی. لەدڵی باوە، کلووە بەفرەکان بەدەوری یەکتردا پێچ دەخۆن، لەخوار پەنجەرە، سێڵاوی شێتانە هاوار دەکات.

ئەی جادووگەر، تۆ لە پڕشەنگی ناکاوی بروسکەی ورشەدار، لەگرمژنی دەستەمۆنەکراوی هەورە تریشقەی خرۆشاو، لەهەوای شێدارو تەماوی خەرەنددا، ئەم نۆشاوە شوومەت دروست کرد، دروستتکرد تا بیدەیتە دەستی ئێمە.

نیوە شەوی دوێ شەو، لەرزانو شڵەژاو، نرکەی گوێ کەڕکەری تۆم بیست، کە هەندێ جار شوومو هەندێ جار پڕلەجۆش و خرۆش بوو، ترووسکەی چاوەکانی تۆم بینیو لەنێو دەستتدا داسێکی تیژم بەدی کرد، کە لەشێوەی برووسکە ئامادەی داوەشاندن بوو، تۆم بینی کە هاتیتە رۆخ نوێنگەی خامۆشم. زرێیەکی درەوشاوەت لەبەر بوو. زنجیرە پۆلاییینەکانی خۆت لەپەنجەرەی مندا داکوتانو گوتت: گوێ بگرە، گوێ بگرە من کێم!

من ئەو ژنە جەنگاوەرە بەهێز و پایەدارەم کە قەت هەستی لاوازی ژنانەم لەخۆدا نەدیوە. هەرگیز کۆترێکی ئارامو دەستەمۆ نەبوومە. بە رك و کینەیەکی پیاوانە دەجەنگم. ئەو مێیەم کە هەمیشە شان بەشانی سەرکەوتن دەڕۆم.





بۆ هەر لایەك كە دەڕۆم پێم دەخەمە سەر لاشەی كوژراوەكانی دەوروبەری خۆم. هێزی تووڕەیی، چاوەكانم دەگۆڕێ بۆ دوو مەشخەڵی ورشەداری شینباوو ژەهرێكی گیانستێن لەمێشكم دادەچۆڕێ!

چۆك دابدە، بپاڕێوە، ئەگەر كرمێكی چووك و چنەی، بمرە! ئەگەر بلێسەی ئاگرێكی درۆزنانەی، خامۆش بە.

## ڕێبوار

ڕێبوار لەتاریكی شەودا، چوست بەڕێی خۆیدا دەڕوات، هاوڕێكانی بریتین لەخەرەندو دەرەی پڕ پێچو گەوەو هەورازی درێژ ڕێبوارانی هاودەم پێیاندا دەڕۆن. شەو جوانەو بێئەوەی رابوەستێو ماندوێتی لەخۆی دەركات، بۆ پێشەوە ملدەنێ. لێ گەلۆ ئەم جادەیە بۆ كوێ دەڕوا؟ ڕێبوار لەو نهێنیە بێئاگایە.

باڵندەیەك لەنێو بێدەنگیی شەودا ئاواز دەخوێنێ. ئاخ، ئەی باڵندەكە، ئەمە چ كارێك بوو كردت؟ بۆچی لە هیكرا خەیاڵو هەنگاوەكانی منت لەجێی خۆجێهێشتو ئەم تالاوە شیرینەی دڵت وەكو ئاوازی خۆت چیاندە گوێمەوە تا ناچارم كەیت لەشوێنی خۆم بوەستمو ئاوازی تۆ بخەمە ژێر پرسو بەرسڤ، ئەم سلاوەی تۆ، بەو ئاوازە مۆسیقییە دڵگیرەی خۆیەوە چ داوێكی لەسەر ڕێی مندا نایەوە؟

باڵندەی جوان دەست لەئاوازخوێندن هەڵدەگرێ: "نا، ئەی ڕێبوارەكە، نا. من بۆ فریودانی تۆ ئاوازان ناخوێنم، بۆ جوانی دەخوێنمو ئەمكارە پەیوەندی بەتۆوە نییە. شەو بۆ من تا ئەو دەمەی كەتەنیام، جوان نییە. بەڵام تۆ كە هەمدیسان دەبێ بەڕێی خۆتدا بڕۆیو هەرگیز خۆت وەدرەنگ نەخەیتو هەست بە ماندوێتی نەكەیت، كارت بەو كارانە نەبێ. لەخۆڕا لەشوێنی خۆت مەوەستە. مەگەر، ئەی ڕێبوار، ئاوازی دڵگیری من چ خراپەیەكی دەرهەق كردووی؟ باڵندە جوانەكە بێدەنگ دەبێو بەخۆی دەڵێ:"مەگەر ئاوازی دڵگیری من چ خراپەیەكی دەرهەق بەو كردووە؟ چما ئەو ڕێبوارە پیادەیە ئاوا لەجێی خۆی ڕەق ڕاوەستاوە؟





## لەسەر بەستەڵەكدا

كاتی نیوەڕۆ، دواجار هاوین وەك زارۆیەك بە چاوی شەكەتو ورشەداریەوە لەدامێنی چیا ڕووەو سەرەوە هەڵدەكشێ. ئەویش قسان دەكا، بەڵام تەنێ چاوەكان لەقسەكانی دەگەن. هەناسەی لەهەناسەی نەخۆشێكی شەوانی تاولەرز دەچێ. دوندە بەستەڵەكیەكان و سنۆبەر و سەرچاوەی ئاوەكان وەڵامی دەدەنەوە ـ لێ تەنێ چاوەكانی ئەون كە لەو وەڵامە تێدەگەن. ئەوسا سێڵاو وەك بڵێی سلاوی لێبكا، خرۆشاوتر لەجاران، لەناخی زنارانەوە دەردەپەڕێو دەست لەسەر لێو ستوونێكی سپیو لەرزان، تژی تژی لەتاسە، لەشوێنی خۆی رادەوەستێ. نیگای سنۆبەر، لەنێوان بەستەڵەكو زناری كپو مردوودا، لەهەموو دەمێك زیاتر دەبێ. بروسكەیەكی ناكاو دەدرەوشێ، كە من وەك نیشانەیەكی نهێنی ئاشنام لەگەڵێدا.

ئەمە هەمان ئەو بروسكەیە لە چاوانی پیاوێكەوە دەدرەوشێ لەسەرەمەرگدا بێ‌و كوڕەكەی بە نیگەرانیو پەرێشانیەوە هامێزی لێدەدا و ماچی دەكاو دایدەنێتەوە. لەو كاتەدایە كە جارێكی تر تروسكەی ڕووناكی بۆ چاوەكانی دەگەڕێتەوەو نیگای كە بەو دوایین گڕە دەسووتێو دەبێتە خۆڵەمێش، دەڵێ: ڕۆڵەكەم! ئاخ ڕۆڵەكەم، دەزانی كە چەندم خۆشدەوێی.. هەمووان ئاوا بەتاووتینەوە دەدوێن ـ بەستەڵەك، جۆگەو جۆبارو سنۆبەر، گشتیان بەیەك نیگا، یەك قسە دووبارە دەكەنەوەو دەڵێن: ئێمە تۆمان خۆشدەوێ، ئاخ ڕۆڵەكەمان، دەزانی كە چەند خۆشماندەوێی!

.. ئەو، ئەو زارۆیەی كە چاوەكانی شەكەتو ورشەدارن، بەپەرێشانیو خەمبارییەوە هەمووان ماچدەكا، خۆشەویستییێكی زیاتر دەنوێنیو مەیلی لەگەڕانەوە نییە.

وشەكانی كاتێ لەنێو دوو لێوانی دێنەدەر، لە ئاخو هەناسەیەك پتر نین.

دەربڕینێكی زۆر تاڵە كە دەڵێ: سلاوی من، خواحافیزیو ماڵاواكردنە، هاتنم ڕۆیشتنە، گەنجمو دەمرم.

هەموان گوێ لەقسەکانی دەگرنو بەدژواری هەناسە دەدەن. هیچ باڵندەیەك ناجریوێنێ. ئەو دەم لەرزەیەك وەك بروسکەیەك لەناخی چیاکانەوە تێدەپەڕێ. هەرچی هەیە دەکەوێتە بیر و خەیاڵان و خامۆش دەبێ.

نیوەڕۆ بوو کە دواجار هاوین وەك زارۆیەك بەچاوانی شەکەتو ورشەدارەوە لەداوێنی چیاوە بەرەو سەرێ هەڵکشا.

## پایز

پایز هاتووە. ئاخ! دڵت بە هەوای گیراوی پایز خەم دایدەگرێ. گەر دەتەوێ لەدەستی خەمان رزگاربی، بفڕە! بفڕە!

خۆر بەسەر ترۆپکی چیاکاندا دەخزێو هەڵدەکشێ. لەهەر هەنگاوێکدا تاوێك دەوەستێو هەناسەی تازە دەکاتەوەو دیسان هەڵدەکشێ.

دنیا چەند خەماوییە! شنە لەژێیە سستەکانی جیهان دەداو ناڵەی خەم تێهەڵدەکات. ئومێد رایکردووە، لێ هێشتا ناڵەی سکاڵاکەرانە لەدوورەوە دەبیسترێ.

پایز هاتووە! ئاخ! دڵت بەو تاریکییەی پایز خەمگین دەبێ. گەر دەتەوێ لەدەستی خەمان قوتاربی، بفڕە!

ئەی میوەی درەخت، چما دەلەرزی؟ مەگەر تەمای هەڵوەرینیت هەس؟ بەراست شەو لەتاریکیی خۆیدا چ نهێنییێکی فێرکردووی کە ئێستا ئاوا لەرزەیەکی سەرمابردوو گۆنا ئەرخەوانییەکانتی داگرتووە!

پایز هاتووە! ئاخ دڵت چەند بەو تاریکییەی خەزان خەمگین دەبێ.

گەر دەتەوێ لەدەستی خەمان قوتار بی، بفڕە!

گوڵی ژاکاو دەڵێ: ئەز رند نیم، لێ مرۆڤەکانم خۆشدەوێنو لەکاتی نائومێدیدا دڵیان دەدەمەوە. وەلێ خەڵکی، گوڵەکان ئاسان لەبیر دەکەن. گەر کەسێکیش هەبێ دەست بۆ لای من درێژکا، ئەوا بەنیازی چنینی من ئەو کارە دەکا، بەبینینی من،






بیرەوەریی گوڵە لەمن جوانترەکانی لەدڵدا زیندوو دەبێتەوە. من ئەو نیگایە، ئەو بیرەوەرییە دەبینمو لەبێئومێدیدا گیان دەسپێرم.

پایز هاتووە! ئاخ! دڵت بە تاریکی ئەم پایزە چەند تەنگ دەبێ.

گەر دەتەوێ لەدەستی خەمان دەرباز بی، بفڕە بفڕە!

## لەناوچەکانی باشوورەوە

خۆم بە لکەدرەختێکی بێبەرگو بێبەر هەڵواسیووە، تا لەگەڵ شەکەتیو ماندوێتی خۆمدا تەنیا وەمێنم. ئەمڕۆ میوانی باڵندەیەکم.. هاتوومەتە هێلانەکەی تا تیایدا وەحەسێم. لەکوێم؟ ئاخ دوورم، زۆر دوورم! دەریای سپی، بەئارامی چۆتە خەوەوە. لەدووڕا چارۆکەیەکی ئەرخەوانی خۆی دەردەخا. زنارێکەو دارهەنجیرو بورجێكو بەندەرێكو دەوروبەریشیان عەشقی خەڵكو دەنگی مێگەلی مەڕان، ئەی سەفای ناوچەکانی باشوور، باوەشم بۆ بکەوە!

هەمیشە سەرقاڵی کاری رۆژانە، ئەمە ژیان بوو؟ ئەم رێ رۆیشتنە هەنگاو بەهەنگاوە هەمیشە ئەڵمانی ترو دەبەنگترتان دەکات. دواجار پێمگوت هەڵمگرێو بمبا. باڵندە ئەزی فێری فڕین کردو نزیکەی نیوەڕۆ بوو کە بەسەر دەریادا تێپەڕیم.

کارێکی سەخت بوو. ئامانجێك بوو لەوان وابوو نزیکە، بەڵام من لەکاتی فڕیندا تێگەیشتم کە چەند بەهەڵەدا چووبووم. تێگەیشتم کە فرەزانیی من، داوێکی لەسەر رێمدا نابووەوە. لێ بەمزووانە، بوێریو خوێنو تامی ژیان لەخۆمدا هەست پێدەکەم. بەمزووانە، نیازی ژیانێکی تازەو یارییێکی تازەم کەوتۆتەسەر. بە تەنیایی بیرکردنەوە! من ئەمە ناو دەنێم ژیری، بەڵام بەتەنێ ئاواز خوێندن، تەنها کارێکی دەبەنگانەیە! ئەی باڵندە چکۆڵە بزۆزو نائارامەکان، لەدەوری من کۆوەبن، کۆوەبن بەڵام مەجریوێنن، دەمەوێ بە شانازی ئێوە ئاوازێك بچڕم.

ئێوە هێندە گەنجو بەئۆینو پڕجموجۆڵو بەهەڵبەزودابەزن، دەڵێی تەنێ بۆ عەشق و شادی ئافرێنراون.

ئۆی! لێگەڕێن بامنیش دانپیانانێك بكەم. ـ منیش لەناوچەكانی باشوور، ژنێكم خۆشدەویست، بەڵام ئەو هێند پیر بوو كە دیداری، گریانی دەنایەوە. پیرەژنێك كە ناوی "هەقیقەت" بوو..

## كچی پارێزكار

تا ئەو دەمەی جەستەی چكۆڵەی من جوانە، بەهای ئەوەی دەبێ كە پارێزكاربم: هەمووان دەزانن كە خوا كچی خۆش دەوێن، ئەوانەشی لەهەمووان پتر خۆشدەوێن كە جوانترینن! كەوایە خوا لەگوناهی ئەو كەشیشە لاوە بێنەوایە خۆشدەبێ، كە وەك هەر كەشیشێكی تری تازە پێیخۆشە هەمیشە من بم كە بۆ داننان بە گوناهان دەچمە لای..

نا، پێیخۆش نییە بۆ خۆ لەگوناهان پاككردنەوە بچمە نك ئەو باوكە رۆحانیانە، كە قژی سەریان ماش‌و برنجیە. مەگەر خۆی، ئەو كەشیشە لاوە كە وێڕای ئەو هەموو بەدمەستییە هەمیشە رەنگ‌وڕووی گەش‌و بزۆزو بێئۆقرەیە، چ عەیبی هەیە؟ من پیرەكانم خۆش ناوێن، ئەویش خۆشی ناوێن! وای! خوا چەند ژیرە كە هەموو شتێكی ئاوا رێكو پێك لەگەڵ یەكتر گونجاندووە!

كلێسا دەیەوێ ئەركی خۆی ئەنجام بدا، ئەركەكەشی بریتیە لەلێبوردن. باش هەست دەكات كە پێیخۆشە هەمیشە گوناهەكانی من ببوورێ، ئاخر كێیە كە گوناهەكانی من نەبوورێ؟ منگەمنگێك لەناو دەوڵەت، دواتر سەردانەواندنێك لەبەرامبەر برا رۆحانیەكە! هەر ئەوەندە بەسە تا گوناهی رابردوو پاك بێتەوەو زەمینە بۆ گوناهێكی تازە خۆش بێ.

گەورەیی هەر بۆ ئەو خوایەی كە لەسەر رووی زەوی كچانی جوانی خۆش دەوێن و گوناهی ئەو جوانیە بە گەورەیی خۆی دەبەخشێ!

تا ئەو دەمەی جەستەی چكۆڵەی من جوانە، بەهای ئەوەی هەیە كە پارێزكاربم: هەر كاتێك پیرو كرێت بووم، لێگەڕێ با شەیتان بێتە وێزەم!



## بەلەمی رازاوی

دوێ شەو، ئەو دەمانەی هەمووان لەخەودابوونو با هێند ئارام بەكۆڵانە تەنگەبەرەكاندا تێدەپەڕی، كە دەنگی هەناسەی نەدەبیسترا، من لەتاو بێخەوی هەموو گیانم كەوتبووە ئازار، گەرمای نوێنگە نەیبردمە باوەشی خەوەوە، نەشئەی ترياكو ئارامی ویژدانیش كە سەرچاوەی خەوی قووڵن، كاریان لەبێ خەویم نەكرد. سەرەنجام دەستم لەخەو هەڵگرت، خۆم لەبەركردو بەرەو لێواری دەریا پێم پێوەنا. هەویە شەوێكی دڵگیرو هێمن بوو. بەلەمو بەلەموانم پێكەوە لەسەر لمی گەرمی لێواردا بینین، كە هەردووكیان وەك شوانو مێگەل، چووبوونە خەوەوە ـ ئەودەم رامكرد، كە بەلەمی خەواڵوو لەوشكایی دووركەوتەوە.

كاتژمێرێك تێپەڕی، یا رەنگە دووكاتژمێر، لەوانەشە ساڵێك.

ئەوسا لەناكاو رۆحی من‌و ئەندیشەكانم، هەموویان چوونە نێو تاریكییەوەو بوونە یەك شت، لەو كاتەدا گێژەنێك هەڵیكرد كە كۆتایی نەهات ـ و هەموو شتێك تەواو بوو.

- سپێدە داهات، بەلەمێك بەسەر قووڵاییە تاریكەكاندا هەڵبەزهەڵبەز دەكات، لێ خۆی خەوی لێكەوتووە. هاواری كەسێك، ئینجا سەدكەس بەرز دەبێتەوە: چ رووی داوە؟، چ قەوماوە؟ ئایا خوێنیش بەسەر زەویدا رژاوە؟ نا! هیچ نەبووە. ئێمە گشتمان خەوتبووین، خەوتبووین ـ ئاخ، چەند باش خەوتبووین، چ خەوێكی قووڵمان بەسەر داهاتبوو!

## نەفرەت

ئەی جادووگەری زەمانە، كات هێواش هێواش هەر سات دوای سات لەدەمتەوە دێتە دەرو ون دەبێ. بێهوودە بەنەفرەتو بێزارییەوە هاوار دەكەم: "نەفرەت، نەفرەت لەو گێژاوە هەمیشەییە بێ!"





دنیای پۆڵایین، وەکی گایەکی کێویو کللك ئاگرین کە گوێی لەهاوارەکانی ئێمە نابێ، بەنووکی خەنجەرێکی لەکالان دەرهێنراو، لەسەر قووڵایی ناخمەوە نەخشی ئازارو دەردان دەکێشێ. دەنووسێ: "دنیا دڵی نییە. کەوایە رکو کینە نواندن لەدژیدا، گێلایەتییە!"

گشت قۆزاخەو گشت تاو ژەهرەکان بەخەڵات بدە بەمن! ماوەیەکی فرە درێژە کە تۆ دەستو هەنیەی منت خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوە.

چیت دەوێ؟ سەیرە؟ ـ بە چ نرخێك؟ـ

ئاخ نەفرەت لەو کچە هەرزەکارەو لەو بزە گاڵتە جاڕییەی! ـ نا، بگەڕێوە. دەرێ زۆر ساردە، لێرەوە دەنگی باران دەبیستم. دەڵێیت: دەبێ لەگەڵتا میهرەبانتر بم، بگرە، ئەم سکەزێڕانە بگرە، چ زێڕێکی ورشەدارن! ـ دەڵێیت: ناوت بنێم " خۆشبەختی"؟ تۆ کە "تا"یت، ستایشت بکەم؟ دروودت بۆ بنێرم؟

دەرکە لەگرێژنە دەردەچێ، باران تا نوێنگەم دێتە پێش، با چراکەم دەکوژێنێتەوە.

- ماڵوێران خۆمان!

- مەرج دەبەستم ئەو کەسەی کە ئێستا سەد قافیەی ئامادەی نەبێ، ژیان لەدەست دەدات.

## ئەم روحە دڕدۆنگانە

ئەز لەو روحە دڕدۆنگانە زۆر بێزارم: هەر رێزو رامانێکی باشتان بەرامبەر بنوێنن، لەجیاتی دڵخۆشی دڵگرانتان دەکەن، ئەو ستایشەی بەرامبەرتان دەریدەبڕن، پێی شەرمەندەو نیگەران دەبن.

سلاو لەمن دەکەن، کەچی لەنیگایاندا ژەهرێکی نەرمی ئیرەیی بردن، کە ئەوەی ناوی ئومێدە تیایدا نییە، دەبینم، چونکە من وەدوای ئەوان ناکەوم.

حەزم لێیە هیچ نەبێ ئەوانە پشتم تێبکەن و ئازایانە جنێوم پێبدەن. ئەوە ناکەن، بەلام دەزانم کە نیگا خەماوییەکانیان هەمیشە لەبارەی منەوە چەوت و بەلارێدا دەڕوا.



## قسە نەستەقەکانی ژنان

کاتێك کە نەخۆشیو شەکەتیمان لێدوور دەکەوێتەوە، لەدووررا پیاوێك دەبینین لێمان نزیك دەبێتەوە. تێپەڕبوونی تەمەنو ئەزموونی ژیان هێزو بڕستێکی نوێ بە باوەڕی لەرزۆك دەبەخشن.

کراسی رەش و کەمدوویی، دوو جلوبەرگن کە لەهەموو جلوبەرگێکی تر جوانتر بە باڵای ژنانەوە دێن.

بەختیاریی خۆم لەکێ دەزانم؟ دەبێ سوپاسی کێ بکەم؟

لە خوای خۆم..و بەرگدرووەکەم!

کیژی گەنج: دوکانی پرلەگوڵ ـ ژنی پیر: ئەژدهایەك کە لەو دوکانە دێتەدەر.

ـ دەنگی داوەتەوە. پێ و پلەکانی جوانن. پیاویشە: وەی خۆزگە هی من با!

## سترانی کچێکی گەنج

دوێنێ کە من کچێکی گەنجم، بووم بە کچێکی ئاقڵ، کچێکی ئاقڵ چونکە تەمەنم گەیشتە هەڤدە ساڵ. نووکە ئیتر وەکو پیرەکان رووگرژو هۆشمەندم. تەنێ هەر مووەکانم وەك ئەوان سپی نین!

دوێنێ بیرێکم بە مێشکدا هات ـ بیرێك؟ نا بە هەڵە گوتم، هەستێك بوو. چونکە ژنان ناتوانن بیر بکەنەوە!

زۆر هەڵەیە ژنێك خۆی لەقەرەی بیرکردنەوە بدات، زانستی کۆن گوتویە: "ژن دەبێ بەو رێگایەدا بڕوا کەبۆی دیاری کراوە، نەك خۆی رێگایەك هەڵبژێرێ!، لێ ئەو ژنەی بیر دەکاتەوە، ناتوانێ ملکەچو گوێڕایەڵ بێ!" ئەوە بیریشی کردەوە، خۆ بیرکردنەوەکەی لەبیری سیسرکەیەك کە هەڵقۆزێتەوە و بگەزێ زیاتر بەهای نییە.

زانایان گوتویانە: "گیاوگۆڵ زۆر بەدەگمەن بیردەکاتەوە، ئەگەر بیریشی کردەوە، بیکردنەوەکەی پووشێك نایەنێ!"





درەوودی زۆرم بۆ حیکمەتی سەردەمانی کۆن کە دووبارە زیندوو بۆتەوەو هەنووکە وەرن تازەترین شیلەی حیکمەتی من تامکەن، ئەو حیکمەتە دوێنێ قسەی لەگەڵدا کردمو وەك هەمیشە لەقووڵایی ناخی بوونی منەوە سەرچاوەی گرت. پێی گوتم: "رەنگە ژنان جوانتربن، لێ پیاوان بە دڵنیاییەوە... سەرنجڕاکێشترن".

## ئاوارە

قەلەکان دەقاڕێننو بەباڵەکراوەکانیان، سەروسەدایان ناوەتەوە و بەرەو شار دێن. نووکە ئیتر نۆرەی بەفری زستانە. خۆشبەختە ئەو کەسەی زێدێکی هەیەو بۆ خۆی پاراستوە!

بە پێی سەرمابردووتەوە، لەجێی خۆت دەوەستی. دەمێکە سەیری دواوە دەکەیت. ئەی شێتی بێچارە، مەگەر چیت کردووە کەوا بەر لەهاتنی زستان سەری خۆت هەڵگرتووە و ئاوارە بوویت؟

دنیا، دەرگایەکە بەڕووی بیابانە زۆرو کپو بەستەڵەکییەکاندا کراوەتەوە.

بۆ کەسێك کە وەك تۆ شتێکی بەو گرانییەی لەدەست دابێ، ئیتر ئارامییەك بەدی ناکرێ!

رەنگبزڕکاو، بەرێی خۆتدا دەڕۆیت. ناچاری بەرگەی نەفرەتی شاڕێیە زستانییەکان بگری. لەدووکەڵێك دەچی کە بەردەوام بەرەو ئاسمانی ساردتر هەڵبکشێ.

هۆ باڵندە، تێپەڕەو بەسەر بیاباندا هاواری تاڵی خۆت هەڵدە.. تۆ، هەی شێتەکە، دڵی خۆت کە خوێنی لێدەتچێ، لەژێر بەفرو نەفرەتدا بشارەوە.

قەلەکان هاوار دەکەنو بەباڵەکراوەکانیانەوە، سەروسەدایان ناوەتەوە و بەرەو شار دێن. هەنووکە ئیدی نۆرەی بەفری زستانە.

خۆشبەخت، ئەوەی زێدێکی هەیەو بۆ خۆی پاراست!



## گۆشەگیر

تەریك کردن و تەریك بوون، بەلای منەوە هەردووکیان ناپەسەندن. ئامادە نیم مل بۆ هیچ کەس دابنوێنم، خۆیشم نامەوێ کەس ملکەچم بێ. ئەو کەسەی لەخۆی نەترسێ، کەس ناترسێنێ، تەنێ ئەو کەسەی ئەوانی دی دەترسێنێ دەتوانێ فەرمانیان بەسەردا بکات. من ئەوکارە چۆن بکەم کە تەنانەت لەبەڕێکردنی ژیانی خۆشم نارازیم؟

حەزم لێیە وەك گیاندارانی دارستانو دەریاکان، ساتێك خۆم فەرامۆشکەم. لەگۆشەی تەنیاییدا رووبنیشمو بەخەونو خەیاڵی درێژەوە سەرقاڵ بم. خۆم لەدوورەوە بۆ ئێرە بانگ کەم، تا دەست لەدڵی خۆم هەلگرمو لەخۆم بترازێ تێکەڵی هیچ کەس نەبم.

## تکا

لەرازی دەروونی زۆر کەس ئاگادارم، بەڵام هێشتا ئاگادارنیم خۆم کێم! چاوی من دراوسێیەکە زۆر زیاتر لەپێویست لەمنەوە نزیکە، بۆیە ناتوانێ خودی من ببینێ. چەندم حەز لێبوو کەمێك خۆم لەخۆمەوە دووربگرم، دوور بگرم تا باشتر سەیری سیماو روخساری خۆم کەم!

لێ نامەوێ بچمە شوێنێك کە دوژمنەکەم دووربێ لێم، چونکە تەنانەت نزیکترین دۆستەکانیشم لەئەندازەی پێویست زیاتر لێمەوە دوورن. پێمخۆشە مەودایەکم لەگەڵ دۆستو دوژمندا لەنێواندا هەبێ، تا تەنێ ئەوەی پێویستە لەخۆمدا ببینم، لەسیمای خۆمدا سەیری کەم.

ئێستا تێگەیشتن چیم دەوێ؟

## بەدکاران

لەمن دەترسن؟ بەڕاست لەبەر کەمانی کشراو هەراسانن؟ بەڵێ، چونکە لەوانەیە کەسێك بێو تیری خۆی بخاتە نێویەوە.





ئەفسووس، ئەی یارانی من، ئەو شتەی کە ناوی "چاکە" بوو چی لێهات؟ باشەیل بۆ کوێ چوون؟ بەڕاست رتووشی ئەو هەموو درۆیانە چی لێهات؟

تەنێ شاعیر کە باش دەتوانێ درۆ بکات، دەشێ هەقیقەت لەو نێوەدا روون کاتەوە.

ئەوانەی کە فرەزانتر بوون، بۆ دڵدانەوەی من گوتیان: "چ ناکرێ، مرۆڤ خۆڕسك خراپە!"

## لە دنیا بێزاران

ئەو رۆژگارانەی کە خەڵك لەسەردەمی ئێمە باشتر بیریان دەکردەوە، ئەو رۆژگارانەی کە لەدوێنێی ئێمەو ئەمڕۆی ئێمە زیاتر بیریان دەکردەوە..

لەژن دوور کەوتنەوە، خواردنی کەمو خراپیان خوارد، سەیری ئەندامی خوارەوەی خۆیان نەکرد، پیسو بۆگەنیو بوون! ئەمە لەدیدی ئەواندا بۆ نزیکبوونەوە لەخواو رەزامەندیی ئەو پێویست بوو!

ئێستاش، ئەوان لەئاسمانێکی هەوراوی کە لەدواوەڕا تیرو بیری ژەهراوی دەگرنە دوژمنەکانیان، جنێو بە بەختەوەرەکان دەدەن! حەزیان لەخەڵکەو کەس حەزیان لێناکات. خۆیان بەچەنگو ددان یەکتری دادەپلۆسن، چونکە کەس ئامادە نییە ماچیان بکات.

لەبری هەموو شتێك، خواردنی گۆشتو هاودەمیکردنی ژنانیان لەبیر کردووە: لەوە باشتر نەیاندەتوانی خۆیان سزا بدەن.

## لەنێو دوژمناندا

ئەوێ دار، ئێرە پەت، ریشی سووری میرغەزەبو بازنەی خەڵكو نیگا ژەهراوییەکان، لەم نێوەدا بۆ من هیچ شتێکی تازە بوونی نییە!



سەد جار ئەم دیمەنەم لەتەك خۆمدا دیوە. ئێستاش ئیتر کە دەیبینم، پێکەنینی گاڵتەجاڕانەی خۆمتان بۆ دەنێرم. چ سوودێکی هەیە، ئاخر چ سوودێك کە من لەدار بدەن؟ بۆ ئەوەی بمرم؟ بەڵام من ناتوانم بمرم!

ئێوە، ئەی سواڵکەران، بەخیلیم پێدەبەن، چونکە من شتێکم هەیە کە ئێوە قەت ناتانبێ، هەڵبەت، هەڵبەت من ئازار دەکێشم! بەڵام ئێوە، بەڵام ئێوە دەمرن! من تەنانەت دوای بڕینی سەد پلیکانەی کوشندەش دیسان هەر هەناسەم، رۆحم، نوورو رۆشناییم.

چ سوودێکی هەیە، ئاخر چ سوودێك کە هەڵمدەواسن؟ بۆ ئەوەی بمرم، بەڵام من، ناتوانم بمرم! نا!





❊

لەو دەمەی دەستم کنوکۆ هەڵگرتووە فێری "رێ دۆزینەوە" بوومە. لەو کاتەیڕا کە بایەك لەدژمدا کەوتە شەڕو ململانێ، هەموو باکانم خستۆتە ژێر رکێفی خۆمەوە.

❊

لەهەر شوێنێکی، تا دەتوانی زیاتر زەوی هەڵکەنە، چونکە سەرچاوەکان هەمیشە لەقووڵایی زەویەوەن. بهێڵە دەبەنگەکان هاوارکەن: زۆر مەچۆ خوارێ، دەنا دەگەیتە دۆزەخ!

❊

ــ ئایا نەخۆش بوومو هەنووکە چاك بوومەتەوە؟ بەراست کێ پزیشکم بوو؟ چۆن رێی تێدەچێ ئەو هەمووانە لەبیر چووبنەوە!

ــ تەنیا ئێستا دڵنیام کە بەڕاستی چاك بوونەتەوە، چونکە تەنێ ئەو کەسە لەش ساخە، کە باش لەبیری بچێتەوە.

❊

لەزەوی تەختایی مەمێنە، زۆریش چنگەڕنێ مەکە، کە زیاد لەپێویست بۆ سەرەوە هەڵکشێی، چونکە جوانترین دیمەنی دنیا دەتوانی لەنیوەی رێگا ببینی.

❊

هەڵبەت خۆشبەختیی من... هەوڵ دەدا خۆشبەختم کاـ لەبنەڕەتدا هەموو خۆشبەختییێك تەنیا ئارەزوویێکی هەیە ئەویش ئەوەیە خۆشبەخت بکات!

کەوابوو، ئایا حەزتان لێیە گوڵەکانی باخچەی من بچنن؟ ئەگەر دەتانەوێ گوڵەکانی من لێبکەنەوە، دەبێ خۆبچەمێننەوەو خۆ لەناو زنارو دەوەنجارە درکاویەکاندا وەشێرنو زۆریش ئەنگوستتان بخەنە دەمتانەوە تا شوێنە براوەکانی بمژن.



چونکە خۆشبەختیی من.. هەمیشە گەرەکیەتی بزۆزی بکات!

چونکە خۆشبەختیی من.. هەمیشە مەیلی لەگاڵتەکردنە بەوانی تر!

بەڕاست حەزتان لێیە گوڵەکانی من لێبکەنەوە؟

❊

بەخشینو دەستکراوەییێکی بێهوودە ئەنجام دەدەم. بێگومان بەکەسێکی کەمتەرخەمو سوکبارم دادەنێن، بەڵام ئەوەی شەڕاب لەپیاڵەی زۆر پڕ بخواتەوە، دەبێ بێئەندازە بخواتەوە: شەراب گوناهی چییە؟

❊

سەختگرو نەرمو نیان، زبرو ناسك، بێبەشو بەبەش، پاكو ناپاك، ژوانگەی شێتانو ئاقڵان: من ئەمانە گشتیانم. دەمەوێ هەبم، چونکە دەمەوێ هەم کۆتر بم، هەم ئەژدیها، هەم بەچکە بەراز.

❊

دەتەوێ چاوو رۆحی خۆت ماندوو نەکەیت؟ بەدوای خۆردا برۆ.. بەڵام هەوڵ دە لەسێبەردا بیت..

❊

رۆحە بچووکەکانم خۆش ناوێن، خۆشم ناوێن چونکە شتێکی باشیان تیا بەدی ناکرێ، دەکرێ بڵێین هیچ شتێکی خراپیشیان تیا بەدی ناکرێ.

گەر دەتەوێ کونێکی بچووك بایەکەت فش نەکاتەوە، بێهوودە با مەکە.





*

پیاو لەگەڵ خۆیدا بیر دەکاتەوە: "هاوڕێیەتی ژن بکە تا لەززەتی لێوەربگری"، بەڵام ژن، هاوڕێیەتی ناکات، بەڵکو دەدزێ.

*

دەبێ سەدپلە بچمە سەرێ، دەبێ بچمە سەرێو گوێم لێیە دەڵێن: "مرۆڤێکی چەند سەرسەختی! مەگەر ئێمە تاشەبەردین کە بە سەرماندا بۆ سەرەوە بچی؟

سەیرە! من دەبێ سەد پلە بچمە سەرێو هیچ کەس نایەوێ تاکە پلەیەکی من بێ!

*

"ئیتر ڕێگای من تەختو هەموارە! هەمووی دۆڵ، هەمووی بێدەنگی!"

مەگەر خۆت ئەوەت نەدەویست؟ مەگەر خۆت کوێرە ڕێت هەڵنەبژاردبوو؟ وای، ڕێبوار هەوڵدە نیگات ڕۆشن بێو هێمنیی خۆت بپارێزە، چونکە ئەگەر باوەڕت بە بوونی مەترسی هەبێ، مانای وایە نابووت بوویت!

*

بۆ ئەوەی خۆشبەختیت ئازارمان نەدات، خۆت لەژێر بەرگی شەیتاندا خستۆتە رووو ڕۆحی شەیتانت خواستۆتەوە، بەڵام هەموو هەوڵت بێهوودەیە: چونکە هیچ نەگۆڕاوی. هەمان ئەو مرۆڤە پیرۆزەیت کە هەبووی!.

*

بەڵێ ئەو ئێوە دەبینێو ئیرەیی نابات، بۆیە ستایشی دەکەن؟

بەڵام خۆ ئەو پێویستی بە ستایشکردنی ئێوە نییە. مەگەر نابینن نیگای وەک نیگای هەڵۆیە، کە تەنێ شوێنە دوورەکان دەبینێ؟ نابینن کە ئێوە نابینێ، ناتانبینێ چونکە تەنێ ئەستێرەکان، تەنێ ئەستێرەکان دەبینێ!



*

ئەی یاران، گشت بەختەوەریەکانی ئەم جیهانە لەمەیدانەکانی جەنگەوە دێن. بەڵێ، بۆ دۆزینەوەی دۆست، دووکەڵو بارووت پێویستە. یەکێك لەو سێیانە دەتوانێ دۆست بێ:

ئەو برایانەی کە لەکاتی پێویستدا یەکتریان دۆزیبێتەوە، یان ئەوانەی لەبەرامبەر دوژمندا یەکسانن، یان ئەوانەی کە لەپێشوازیکردنی مەرگدا ئازاد بن!

*

لەدوی شانو شکۆو ناوبانگ دەگەڕێیت، کەوایە پەندی من لەبیر مەکە: لەکاتی خۆیو تاکو هێشتا ئازادی، دەست لەشەرافەت بەردە!

*

چەمەنزارانو ڕێبوارانی ماندوو، جنێوان بەخۆر دەدەن، لای ئەوان بەهای درەخت لەدرێژایی سێبەرەکەی دایە!

*

لەخەڵکی دوورمو دیسانیش سوودیان پێدەگەیەنم. بە ڕێگای خۆمدا دەڕۆم، جارێ خۆرمو جارێ هەور، بەڵام هەمیشە بەرزەنشینم!

*

سەیرە! ئەم خانمە نیشانەیەکی لەعەقڵو ژیری تیایە:

ئەم دووانەی لەکوێ بە دەست هێناوە؟

*

بەڕاست ماوەیەك پێش ئێستا بووـ کە پیاوێك بۆ ئەو عەقڵی لەدەست دا. پێش ئەم شێتبوونە، کەسێکی عاقڵ بوو، لێ عەشق لەکەللەی داو شەیتان عەقڵەکەی لێدزی ـ نا، نا: شەیتان نەیدزی، ژن دزی!





❊

نیگارکێشی ریالیست، سروشت، سەرجەم سروشت وەك ئەوەی کە هەیە، دێنێتە سەر تابلۆ ـ چۆن دەتوانێ ئەو کارە بکات؟ ئاخر چۆن رێی تێدەچێ دیمەنێکی تەواوی سروشت وێنا بکرێ؟ خۆ بچووکترین بەشی جیهان خۆی جیهانێکی بێپایانە کە ناتوانرێ بخرێتە سەر تابلۆ. بەناچاری نیگارکێشی باش ئەوەی کە مەیلی لێیە وێنەی بکێشێ، ئەوە دەکێشێ‌و حەزی لێیە وێنەی چ شتێك بکێشێ؟ ـ ئەوەی کە "دەتوانێ" وێنەی بکێشێ!.

❊

ئەو مرۆڤە ببینن کە رۆژ بەرۆژ بۆ سەرەوەتر دەروا ـ دەبێ ستایش بکرێ! بەڵام ئەوەیان کە هەمیشە لەسەرەوەکان دێت! پێویستی بە ستایشکردن نییە، چونکە لەبنەرەتدا هی ئەم زەوییەی ئێمە نییە، هی سەرەوەکانە!

❊

بەڵێ دەزانم، لەکوێ دابەزیوم! وەکو بڵێسە ئارام ناگرم، دەسووتێم‌و خۆم دەکەمە زوخاڵ. سەراپای بوونم دەگۆڕێ‌و دەبێتە رووناکی‌و لەنێو دەچێ‌و لەزووخاڵێکی ساردوسڕ بترازێ شتێکم لێنامێنێتەوە. ئاخ! راستە، من خۆم بڵێسەی ئاگرم!

❊

ئەمەیە ئەو کتێبەی کە پێیدەڵێن (ئینجیل)؟ کتێبی گشت چاکەو خراپە، کە بە پیرۆزترین نیایشی مرۆڤایەتی دەژمێردرێ، بەڵام چۆنە کە لەدێباچەکەیدا رووداوی زیناکردنێك باس کراوە؟(❊)

❊

هەر پشتکووڕێك رۆژانە زیاتر پێچ‌و تاو بەخۆی دەدا. هەر مەسیحیەك رۆژ لەدوای رۆژ یەهوودی تر دەبێ‌و هەر ئەڵمانیەك رۆژ بەرۆژ ساویلکەتر.

---

(❊) ئاماژە بە لەدایکبوونی عیسایە.





❊

پێشتر ئینگلیزەکان کە هێزی تێگەیشتنیان لەرادەی ناوەراست تێناپەڕێ، دوای فەلسەفە دەکەوتن؟ بەرلەمە ئەوانە کە (داروین)یان هاوشانی (گۆتە) دادەناو تێنەدەگەیشتن کە ئەمە کفرەو سووکایەتیە بە پیرۆزیەکان دەیکەن؟

سڵاو لەئێوە عارەبانچییە دلێرەکان کە هەمیشە بەها لەدوای ژمارەکانەوە دادەنێن، سڵاو لەئێوە کە نەجۆش‌و خرۆشێکتان هەیەو نەچالاکیەك!

هەردەم خراپ دەکەن، بەڵام لەو خراپکردنەشدا زۆر شوولی لێهەڵناکێشن، چونکە هۆشیار نین، بێهەستیشن!

❊

ئەو کەسەی کە رۆژێك دەبێ زۆر قسان بکات، لەناخی خۆیدا بێدەنگی هەڵدەبژێرێ. کەسێك کە دەبێ رۆژێك گێژاو بەرپا بکات، ناچارە ماوەیەکی درێژ ئابڕوومەند بێت.

❊

بۆ ئەوەی باش بژیت، دەبێ خۆت لەسەرەوەی ژیاندا بپارێزی!

کەوایە فێربە هەمیشە بۆ بەرزایی هەڵکشێی ـ فێربە هەمیشە سەیری خوارەوە بکەیت.

❊

ئەو غەریزەیەی کە شکۆدارترین غەریزەیە، بەوپەڕی هۆشیاریەوە شکۆدارتری کە: واتە بەرامبەر هەر کیلۆیەك خۆشەویستی بۆ ئەوانی تر، تەنیا یەك گرام نەفرەت بۆ خۆت زیادکە.

❊

ئەمە قسەی درەختێکە: زۆر تەنیا گەشەم کرد. زۆر هەڵکشام. چاوەڕێم.. لێ دەتوانم چاوەڕێی چی بم؟

هەورەکان ببینە کە بێئەندازە لەمنەوە نزیکن‌و من چاوەڕێی بروسکەی یەکەمینم.

*

نووکە کە خۆر لەرۆشنایی ماندوو بووەو جۆگەلەکانی هەوەس ئومێدی تازەی خۆیان لەبزاوت خستووە، نووکە کە هەموو ئاسمان بەتانوپۆی زێڕینی خۆی بەرۆحی شەکەت دەڵێ "ئیتر ئارام بگرە"، بۆچی ئەی دڵی گیراو، پشوو نادەی‌و هەروا لەپاراستنی رازی سیحرئامێزی خۆتدا منجڕی؟

*

بەرێ دروست لەساڵی پیرۆزی کلێسا "زیبل"ی غەیبگۆی ناسراوی سەردەمی کۆن کە بێشەراب مەست بوو، وەهای گوت:

"بەدبەختی ببینە کەوا هەموو شتێکی دنیا گۆڕاوە. خراپی سەیرکە کە قەت بەم ئاستە نەگەیشتووە! رۆما کە پایتەختی جیهان بوو ئەمڕۆکە بۆتە فاحیشەو فاحیشەخانەیی، قەیسەری رۆم کە سەروەری جیهان بوو تا ئاستی ئاژەڵێك دابەزیوە ـ خواش... بۆتە یەهوودی!"

*

بەتەمام ئاقڵ بم، چونکە خۆم ئەوەم دەوێ نەك کەسێك ئەوەم داوا لێبکات. بەتەمام ستایشی خوا بکەم، چونکە خوا دنیای بەبێماناترین شێوە کە بیری لێبکەیەوە، دروست کردووە.

*

ئەگەر من لاڕێترین‌و کەج‌و کۆڵترین رێگایەکم گرتۆتەبەر کەهەیە، لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤی ئاقڵ ئاوا رێگای خۆی دەست پێدەکات ـو شێت بەم شێوە کۆتایی پێدێنێ.

*



پێکەنین: چ هونەرێکی سەختە! بەمن بڵێن: ئایا پێکەنینی ئەمڕۆم باش نەبوو؟ دەبێ هەوڵ دەم سبەی باشتر پێبکەنم؟ ئایا ئەمڕۆ ئەم تروسکەیەم لەناخی دڵەوە هەڵنەقولابوو؟

ئاخر مێشك لەگەڵ گاڵتە نێوانی کۆك نییە، مەگەر کاتێك کە لەدڵدا ئاگرێك‌و گەرمایەك هەبێ.

*

دروود بۆ تۆ، ئەی دۆستی، ئەی یەکەمین سپێدەی بەرزترین ئومێدی من! بەداخەوە کە جادەو شەو بۆ من بێکۆتایی بوون. هەموو تەمەنم ناخۆش‌و بێئامانج تێپەڕی، بەڵام ئێستا دەمەوێ دووبارە بژیم، چونکە لەچاوەکانی تۆدا، ئەی خواوەند، ئەی خۆشەویستی من بروسکەی ئێوارەو بروسکەی سەرکەوتن پێکەوە دەبینم!

*

بەختیاری، ئەی بەختیاریـ، ئەی جوانترینی دەستکەوتەکان کە هەمیشە نزیك‌و هەمیشە دووری، هەمیشە سبەیت‌و هەرگیز ئەمڕۆ نیت، ئایا ئەو راوچییەی کە ئارەزووی راوکردنی تۆی لەسەردایە، بە بڕوای تۆ زۆر گەنج دیارە؟





## سەرچاوە

(بهترین اشعار نیچه سرودەهای زرتشت)

و. بۆ فارسی (شجاع الدین شفا)

**بەرهەمە چاپکراوەکانی تری وەرگێڕ:**

- کتێبی (لیبرالیزمو دیموکراسی)، نووسینی (نۆربێرتۆ بۆبیۆ)، سلێمانی /٢٠٠٠.
- (چیرۆكو چیرۆکنووس)، نووسینی (مەنسووری یاقووتی)، سلێمانی/٢٠٠٠.
- تایبەتمەندیەکانی کادیرو رۆڵی حزب لەپێگەیاندنیدا، نووسینو ئامادەکردن، سلێمانی/٢٠٠٠.
- کتێبی (کۆمەڵی مەدەنی، ئازادی، ئابووریو سیاسەت)، نووسینی موسا غەنی نەژاد، سلێمانی/٢٠٠١.
- کتێبی (دیموکراسی لەرووی مێژوویی و تیۆریەوە)، نووسینی (ئانتۆنی ئاربلاستەر)، سلێمانی/٢٠٠٢.
- کۆمەڵە چیرۆکی (سەمای مەرگ)، (بوزۆرگی عەلەوی)، سلێمانی/٢٠٠٢.
- (ئانارشیزم) کتێبی گیرفان، نووسینی (د.مستەفا رەحیمی)، سلێمانی/ ٢٠٠٢.
- (ناسیۆنالیزم)، نووسینی (فرێد هالیدای)، سلێمانی/٢٠٠٢.
- رۆمانی (سپێدان ئێرە ئارامە)، نووسینی (بوریس ڤاسیلیڤ) بە هاوبەشی لەگەڵ زرار جۆلا، سلێمانی/٢٠٠٣.
- (ناسیۆنالیزم)، نووسینی (ریچارد جێی)، سلێمانی/٢٠٠٣.
- کتێبی (سەلاحەدینی ئەیووبی یان کورد لەمیسر)، نووسینی جۆرجی زیدان، سلێمانی /٢٠٠٤.



- (گەشتەکانی مارکۆپۆلۆ)، و.بۆ فارسی (زۆهرێ میرتاهێر)، سلێمانی/٢٠٠٥.
- (ئاشنابوون بە هیگڵ)، نووسینی (پۆل ستراتێرن)، هەولێر.
- (بنچینەکانی فیدرالیزم)، نووسینی (ئەسەدوڵلای ئەلەم)، سلێمانی.
- (ئاشنابوون بە ئەفلاتوون)، نووسینی (پۆل ستراتێرن)، سلێمانی.
- (محەمەدی قازی کێیەو چی کردووە)،(سەید عەلی سالحی)، سلێمانی/٢٠٠٦.
- (لەودیوپەردەدا درۆی گەورە)، نامیلکە، نووسینی (محەمەد رەزا موعین فەر)، سلێمانی/٢٠٠٠.
- (گەشەسەندنی سیاسی و کۆمەڵی مەدەنی)، نامیلکە، نووسینی (مەسعود ئەخەوان کازمی)، سلێمانی/٢٠٠٠.
- (مافی مرۆڤ دەسەڵاتی نیشتمانی)، نامیلکە، نووسینی (ئایەت مەولائی)، سلێمانی/٢٠٠١.
- (هۆکاری گۆڕان)، نامیلکە، نووسینی (فلیپ سادلەر)، سلێمانی/ ٢٠٠٢.
- هەروەها دەیان وتارو لێکۆڵینەوەو بابەتی رۆژنامەیی تر کە لەرۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستاندا بڵاوکراونەتەوە.
- کتێبی (دوو سەدە بێدەنگی)، بە هاوبەشی لەگەڵ موسا مەمەدەرەش.

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

- (کتێبی جیهانی راستەقینەی دیموکراسی)، نووسینی سی بی مەکفەرسۆن.
- کتێبی (یادداشتەکانی رۆژانی تەنیایی)، نووسینی گابرێل گارسیا مارکیز.
- کتێبی (ئاشنابوون بە ئەرستۆ).
- کتێبی (ئاشنابوون بە دێکارت).



